# چل فەرموودەی پێغەمبەری نازدار ﷺ

# دەربارەی باوەڕ و کرداری باوەڕدار

نووسین و ئامادەکردنی: باوکی شافعی



چل فەرموودەی پێغەمبەری نازدار ﴿ﷺ﴾

دەربارەی باوەڕ و کرداری باوەڕدار

بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک: چل فەرموودەی پێغەمبەری نازدار ﷺ
دەربارەی باوەڕو کرداری باوەڕدار

نووسین و ئامادەکردنی: باوکی شافعی

نەخشەسازیی ناوەوە: عبدالله خاکی

نەخشەسازیی بەرگ: هەنگاو بەدر

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٣ کۆچی – ٢٠٢٢ میلادی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە « »ی

ساڵی «٢٠٢٢»ی پێ دراوە.

## بەرهەمی پرۆژەی ئاگا ...............................(٦)




پرۆژەی ئاگا :: Aga project


پرۆژەی ئاگا :: Aga project

**ژمارەی پرۆژە:**

٠٧٥٠٧١٤٧٠٣٧

٠٧٧٠٤٣٣٧٦٠٥



# پێشەکی: سالار عومەر

فەرموودەکانی رسول الله ﴿ﷺ﴾ بابەتێکی سەرەکییە کە ئەمڕۆ لەجیهاندا لە لایەن دینە دەستکردەکان و حکومەتە لادینییەکانەوە دژایەتی زۆری دەکرێت، ئەمەش بۆ ئەوەیە تا فەرموودە لەبەرچاوی موسڵمانان بخەن و گومان بخەنە بیروباوەڕیان و دایانبڕن لە فەرموودە و لەپاکی بەرە و پیسی و لە حەقیقەت وابەستەی خورافیات و لە مرۆڤ بوونەوە بەرەو ئاژەڵ بوونیان ببەن و وابەستەی بەرنامە ناتەواو و پڕ لەدواکەوتوییەکانی خۆیانیان بکەن.

جگە لەوە لێرەو لەوێش کەسانێکی دڵ لەرزۆک و عەقڵ بەستووی شیرەمژەی عەلمانیەت، هاتوون دژایەتییەکی زۆری فەرموودە دەکەن و تانەی لێدەدەن، ئەو کەسانەش بەکرێ گرتەی عەلمانیەتن و پارە و پلە و پۆست و ڕاگەیاندنی بەهێزیان خراوەتە خزمەت تا بەهەموو هێزیان فەرموودە ڕەد بکەنەوە و لەکاری بخەن، لەکار کەوتنی فەرموودەش وەک ئەو باڵندەیەیە کە باڵێکی لێ جیابکەیتەوە و لەناو کۆمەڵێ دڕندە جێ بهێڵرێت و داوای لێبکرێت پشت بەفڕین ببەستێت بۆ خۆڕزگارکردن.

بەڵێ ئەم دژایەتیکردنە بۆ ئەوەیە کاتێک فەرموودە کەوت و خەڵکی پشتیان لێی کرد ئەوکات قورئانیش ئاسانتردەبێ تا بەکەیفی عەقڵە خاڵییەکەیان لەژێر ناوی ڕۆشنفکری زمانە درێژ و دەمە پیسەکەیان لەناو قورئان بنێن و تەفسیراتی هەڵە بۆ دەقە قورئانییەکان بکەن و سەر لە خەڵکی بشێوێنن.

بەداخەوە کەسانی بەناو موسڵمانیش بێبەش نین لەدژایەتیکردنی فەرموودەکانی ئازیزمان ﴿ﷺ﴾ کە ئەو جۆرە کەسانەش هەر کۆمەڵێکیان لەژێر ناو و گرێێکدا نەفامانە ئەو دژایەتییە دەکەن، لەکاتێکدا زۆرجار بەرگری لە قورئانیش دەکەن بەڵام نازانن کە هۆکاری گوتنی فەرموودە ڕێگایەکی فرە گرنگە بۆ هەڵێنجانی بڕیارە شەرعییەکان و تێگەیشتن لێیان، بێگومان فەرموودە شیکەرەوەیە بۆ قورئان و کارپێکردنی دەقە قورئانییەکان.

بۆیە پێویستە موسڵمان بە گشتی بۆ تێگەیشتنێکی تەواو و درووست لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ ئاگادارییەکی باش و ووردی هەبێت لە کات و شوێن و ژینگە و بارودۆخی ئەو فەرموودانە، تابەهۆی شارەزاییەکەیەوە بچێتە مەیدانی دژایەتکارانی فەرموودە و چۆکیان پێدابدات و وتە پوچەکانیان هەڵبوەشێنێتەوەو زمانیان لەکاربخەن، یان هیچ نەبێ موسڵمان ئەو شارەزاییەی بۆخۆی هەبێ تا عەقڵی نەداتە دەست ئەوکەس و کۆمەڵە گومڕاو دۆڕاوانە و لەژێرهیچ ناو و ناونیشانێک نەکەوێتە ژێر کاریگەرییان.

گومانی تێدانییە رسول الله ﴿ﷺ﴾ مافی زۆری بەسەر ئێمەوە هەیە، لەوانە: ئیمانی ڕاستەقینە بە پێغەمبەرایەتی ﴿ﷺ﴾ ئەو بەکردار و گوفتار و بەڕاست زانینی هەر چییەک ئەو هێنابێتی، گوێڕایەڵیکردن لەفەرمان بەچاکە و نەهی لەخراپە، ڕازیبوون بە دادوەری و حوکمی ئەو، شوێن کەوتنی و کردنی بە پێشەنگ و پێشەوا لەتێکڕای کاروبارەکانی ژیان، خۆشویستنی زیاتر لەگیان و ماڵ و

تێکڕای خەڵکی و بەرگریکردن و سەرخستنی ئایینەکەی و بەرگری کردن لە سوننەتەکەی و چەندینی تر.

دەربارەی باوەڕبوون بە رسول الله ﴿ﷺ﴾ الله تعالی دەفەرموێت: (وَمَن لَّمْ يُؤْمِن بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ فَإِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَعِيرًا)[1]

دەربارەی گوێڕایەڵی دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَا تَوَلَّوْا عَنْهُ وَأَنْتُمْ تَسْمَعُونَ)[2]

دەربارەی شوێنکەوتنی رسول الله ﴿ﷺ﴾ ی بەخۆشەویستی خۆی بەستۆتەوە، وە دەفەرموێت: (قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ)

وە گرنگیدان بە فەرمایشتەکانی رسول الله ﴿ﷺ﴾ ڕاستەوخۆ بەباوەڕەوە پەیوەست کراوە وەک اللەتعالی دەفەرموێت: (قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ)[3]

رسول الله ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ: (كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ إِلَّا مَن أَبَى، قالوا: يا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَن يَأْبَىَ؟ قالَ : مَن أَطَاعَنِي دَخَلَ الجَنَّةَ، وَمَن عَصَانِي فقَدْ أَبَى)[4].

هەموو ئوممەتەکەم دەچنە بەهەشت مەگەر کەسێك خۆی نەیەوێت، گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کەس هەیە نەیەوێت؟، لەوەڵامیاندا فەرمووی:

---

[1]- الفتح (١٣)

[2]- الانفال (٢٠)

[3]- آل عمران (٣٢)

[4]- صحيح البخاري /الصفحة أو الرقم : ٧٢٨٠

ئەوەی فەرمانبەرداری من بێت، دەچێتە بەهەشت، ئەوەی فەرمانم بشکێنێ ئەوە نەیویستووە.

دەربارەی ئەوکەسانەی گرنگی بەسوننەت نادەن رسول الله (ﷺ) دەفەرموێت: (فمَن رَغِبَ عن سُنَّتي فليسَ مِنِّي)[1]. ئەوەی پشت لەسوننەتم بکات لەمن نییە.

کەواتە (وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ )[2] وە ئێوە شوێنی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) بکەون بەڵکو خوای گەورە هیدایەتتان بدات بۆ ڕێگای ڕاست.

لە کۆتاییدا دەڵێین بەڕاستی رسول الله (ﷺ) پێشەواو مامۆستای چاکی مرۆڤایەتیە و شایستەی شوێن کەوتنە بێ هیچ دوودڵییەک، وەک الله تعالی دەفەرموێت: [لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ[3]

لەم پەرتووکە ئاشنا دەبین بە (٤٠) فەرموودەی خۆشەویستمان (ﷺ) کە پەیوەستن بە بیروباوەڕەوە و کۆ کراوەتەوە و ئامادەکراوە لەلایەن برای بەڕێزم (باوکی شافعی) کە هەر فەرموودەیەکی لە ژێر ناونیشانێک داناوە و دواتر باسی کردووە، پەنا بە خوای گەورە کارێکی ناوازەیە و جێگای دەست خۆشی و دڵ خۆشییە، ئامادەکردن و نووسینی ئەم فەرموودانەی سەروەری خۆشەویستمان (ﷺ) و پەیڕەوکردنی لەلایەن خوێنەرانەوە إِنْ شَاءَ اللَّه هەوڵێکی زۆر گرنگە بۆ

---

[1]-الراوي : أنس بن مالك | المحدث : البخاري | المصدر : صحيح البخاري/الصفحة أو الرقم ٥٠٦٣

[2]- الاعراف (١٥٨)

[3]- الاحزاب (٢١)

سەرخستن و گرنگیدان بە سونەتی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بەرامبەر ئەو هەوڵە نەزۆکانەی کە بە هۆیانەوە دەیانەوێت لە پێگەی سونەت کەم بکەنەوە و خەڵکی بە لاڕێدا بەرن و سەروەری خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ ناشرین بکەن.

ئێمەی موسڵمان بمانەوێت نەوەی داهاتوومان شارەزا بکەین لەم کۆمەڵە فەرموودەیەی سەروەری خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ و ئامادەیان بکەین بۆ مەیدانی بەرگری و ڕێگری بکەین لەو هەوڵە دژە ئیسلامییانە، ئەوا پێویستە نەک تەنها لەم کۆمەڵە فەرموودەیە بەڵکو تاکو دەتوانین سوود وەربگرین لە تەواوی فەرموودەکانی پێغەمبەری نازدارمان ﴿ﷺ﴾ و بیانخوێنینەوە و لێیان تێبگەین و بیانکەینە بەشێکی زۆر گرنگی ژیانی ڕۆژانەمان و شوێن کەوتەی ئاینی ڕاست و درووست بین کە الله تعالى و پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾ پێی ڕازین.

چونکە تاکو خۆمان شارەزا نەبین و لە ژیانی ڕۆژانەمان پەیڕەویان نەکەین ناتوانین نەوەی داهاتوو فێر بکەین و ئامادەیان بکەین، چونکە ئەوان چاویان لە ئێمەیە و بۆیە پێویستە نموونەی کەسی پێشەنگی چاک بین بۆیان.

داواکارم لە الله تعالى ئەم هەوڵ و ماندووبوونەی نووسەر وەربگرێت و بۆی بخاتە سەر تەرازووی کارە چاکەکانی، و ئێمەش پڕ زانست و زانیاری بکات بە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی سەروەر و ڕابەر و مامۆستای تەواوی مرۆڤایەتی ﴿ﷺ﴾ و ڕێنوێنی ئێمە و تەواوی خوێنەرانش بکات بۆ کارپێکردن پێیان و بەرگری کردن لێیان و سەرمان بخات بەسەر دژایەتی کەرانی....ئامییین.

**سالار عومەر**

**٢٠٢٢/٥/٢٥ هەولێر**

# پێشەکی

## بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

ٱلحَمدُلِلَّه كَمَا أمر وَ أشكُرُهُ وَ هُوَ ٱلكَفِيلُ بِٱلزِيادَةِ لِمَن شَكَر إعزَازاً لِمَن آمَنَ بِهِ وَ أقَر وَ إرغَاماً لِمَن جَحَدَ بِهِ وَ كَفَر وَ أشهَدُ أن لاَإلَهَ إلااللَّه وَحدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ شَهَادَةً تُنجِي قَائِلَهَا من هَولِ ٱلمَحشَر وَ أشهَدُ أنَّ مُحَمَدَاً عَبدُهُ وَ رَسُولُهُ سَيدُ ٱلخَلاَئِق وَ ٱلبِشرِ مَاٱتَّصَلَت عَينٌ بِنَظَر أو سَمِعَت أُذُنٌ بِخَبَرَ أمَا بَعدُ: يَقُولُ اللَّه تَعالَى﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَائِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ﴾

بەڕاستی لەم ڕۆژگارەی غوربەتی ئیسلام، بە گرنگم زانی وەکو موسوڵمانێکی شوێنکەوتەی پێغەمبەری سەروەر ﴿ﷺ﴾ هەڵسم بە کۆکردنەوەی (چل فەرموودە لە سەر باوەڕ و کرداری باوەڕدار).

هەر وەکو فەرمانمان پێ کراوە بانگەوازی بکەین بۆ تەوحید و یەکخواپەرستی، هەروەکو خوای گەورە فەرمانی کردوە بە خۆشەویستەکەی ﴿ﷺ﴾ و لە ڕێگای ئەوەوە فەرمانی بە ئێمەی ئیماندار کردوە بانگەوازی بۆ ئیسلام بکەین هەروەکو فەرموویەتی: ﴿قُلْ هَٰذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي﴾[1] واتە:

---

[1] - یوسف / ١٠٨

ئەی خۆشەویست بڵێ ئەمە ڕێگای منە بانگەوازی دەکەم بۆ لای خوای گەورە بەڕوونی (بە بەڵگە) من و شوێنکەوتوانی من.

کە ئێمەش خۆمان بە شوێنکەوتەی ئەم خۆشەویستە دەزانین دەبێت بانگەوازی بۆ لای خوای گەورە بکەین، بەرزترین شتیش بانگەوازی بۆ بکرێت تەوحیدە چونکە بانگەوازی تەواوی پێغەمبەران بووە (سەلامی خوایان لەسەر بێت) هەر وەکو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾[1] واتە: ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هیچ پێغەمبەرێکمان پێش تو نەناردوە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە بڵێن هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت تەنها اللّٰه نەبێت کەواتە، دەبێت بزانین نەهێنی و هۆکاری دورستبونمان لە دونیا بۆ تەوحید بووە.

هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾[2] واتە: جنۆکە و مروڤەکانم دروست نەکردوە تەنها بۆ پەرستنی خۆم نەبێت. دەبێت بیزانین عیبادەت و پەرستن وەرناگیرێت ئەگەر لەسەر تەوحید نەبێت، هەروەکو نوێژ بەبێ دەست نوێژ دورست نیە، ئاواش پەرستن بەبێ تەوحید دورست نیە کەواتە، ئەگەر شیرک و هاوبەش دانان چووە ناو پەرستنەوە پوچەڵی دەکات هەر وەکو دەست نوێژ شکان، نوێژەکە پوچەڵ دەکات، کەواتە

[1] - الأنبياء ٢٥
[2] - الذاريات ٥٦

دەبێت زۆر ئاگامان لە شیرک و هاوبەش دانان بێت چونکە تەنها شیرک و هاوبەش دانانە کە هەرگیز خوای گەورە لێ خوش نابێت هەر وەکو فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾[1] واتە: بەڕاستی خوای گەورە لە شیرک و هابەش دانان خۆش نابێت و جگە لە شیرک لە هەموو تاوانێک خۆش دەبێت ئەگەر ویستی لە سەر بێت.

لەم کتێبەدا بە پوختی لە سەرەتادا یەکەم فەرموودە باسی سیفاتی موسوڵمان دەکەین، ئەوجا فەرموودەکانی تر باسی باوەڕ و سیفاتی باوەڕدار دەکەین و کۆتا فەرموودەش باسی ئیحسان و چاکەکار دەکەین چونکە پایەکانی ئایین سێ پایەن ئەویش ئیسلام و ئیمان و ئیحسانە، بۆیە منیش بە پلە بەندی ئاین فەرموودەکانم هێناوە چونکە ئەوەی بی ئەوێت بچێتە ناو ئاینی ئیسلام دەبێت قۆناخ بە قۆناخ ببڕێت.

داوامان لە خوای تعالی یە بە موەحیدی ڕاستەقینەمان هەژمار بکات ئامین

براتان: باوکی شافعی

---

[1] - النساء ١١٦

# فەرموودەی (١)

# دامەزراندی ئیسلام

**﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ﴾**[١] واتە: لە هاوەڵی بەڕێزەوە عبداللَّهی كوڕی عومەر (ڕەزای خوای تعالی لە خۆی و باوكی بێت) لە خۆشەویستەوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ئیسلام لەسەر پێنج بنەما دامەزراوە، شاهیدی دان بەوەی كە هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت جگە لە خوای تعالی، پاشان شاهیدی دان بە پێغەمبەراتی محمد ﴿ﷺ﴾ و ئەنجام دانی پێنج نوێژەكان بە ماف و مەرجەكانیەوە و دەركردنی زەكاتی ماڵەكەی و حەج و زیارەتكردنی مەككەی پیرۆز و بە ڕۆژووبونی مانگی ڕەمەزان.

**ڕوونكردنەوە:** ئەوەی بیەوێت بچێتە ناو بازنەی ئیسلام دەبێت بەو دەروازانە تێپەڕبێت چونكە موسڵمان بوون چەندەها مەرجی هەیە، بۆیە دەبێت مرۆڤ ئەو مەرجانە جێبەجێ بكات، تاوەكو بە موسڵمان هەژمار بكرێت و بچێتە بەهەشتەوە.

[١] - البخاری ژمارەی فەرموودە: ٨ / مسلم ژمارەی فەرموودە: ١٦

کەواتە، دەبێت مرۆڤی باوەڕدار تاقی بکرێتەوە بۆ ئەوەی ڕاستی باوەڕەکەی بۆ خەڵک دەرکەوێت.

هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً﴾[1] واتە: بێگومان ئێمە ئێوە تاقی دەکەینەوە بە شەڕ و ناخۆشی و بەڵاو بەخێرو خۆشی و دارایی و توانایی، سەرەنجام هەر بۆ لای ئێمە دەهێنرێنەوە (تا پاداشتتان بدەینەوە).

ئەوجا هەندێک جار تاقی دەکرێتەوە بە گوتن و زوبان وەکو هەردوو شەهادەی (لاإله إلاالله) ئەویش بە جێبەجێ کردنی هەر حەوت مەرجەکانی.

بە کورتی ئەمانەن:

(١) زانست، بە واتا و مەبەستەکانی.

(٢) دڵ نیا بون و بەبێ دوودڵی.

(٣) قبول و ڕازی بوون بە هەموو ئەوانەی لە خۆی گرتۆتەوە.

(٤) ملّ کەچ بوون بۆ هەموو فەرمانەکانی.

(٥) ڕاست گۆیی واتە بەڕاستی بیڵێت و ڕاست بکەت لەگەڵی.

(٦) ئیخڵاس و دڵ سۆزی.

(٧) خۆش ویستن چونکە پەرستن واتە ئەو پەڕی زەلیلی و خۆش ویستن.

---

[1] - الانبياء ٣٥

شاعیر کۆی کردوتەوە لەو بەیتانەی خوارەوە: **(العلم واليقين والقبول، والانقياد فادر ما أقول، والصدق والإخلاص والمحبة، وفقك اللّٰه لما أحبه)**
پێویستە نەرێ بکات و بەری بێت لە هەموو پەرستراوێک جگە لە خوای گەورە، و ئینجا مەرجەکانی (محمد رسول اللّٰه) چوار مەرجن.

١: باوەڕبون بە هەموو ئەو شتانەی فەرموویەتی.

٢: جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی.

٣: دوورکەوتنەوە لە هەموو ئەو شتانەی قەدەغەی کردوە.

٤: هیچ پەرستنێک ئەنجام نەدات تەنها لە ڕێگای ئەو نەبێت، ئەمە تاقیکردنەوە بوو بە دەربڕین بە گوفتار، و هەندێک جاریش تاقی دەکرێتەوە بە کردار وەکو ئەنجامدانی نوێژەکان، نەک تەنها ئەنجامدانی بەڵکو فەرموویەتی: **(إقام الصلاة)** واتە: ئەنجامدانی بە تەواوەتی مەرجەکانی و واجبەکانی و سوننەتەکانی و بەردەوام بوون لەسەری و دەبێت بیزانین نوێژ چەندەها مەرجی هەیە قبول ناکرێت بە بێ ئەم مەرجانە:

ئەنجامدانی لە کاتی خۆیدا، دەست نوێژ شوشتن، پاکبون لە لەش گرانی، نییەت و مەبەست، داپۆشینی عەورەت، ڕوکردنە قیبلە.

هەندێک جاریش تاقی دەکرێینەوە بە واز هێنان لەو شتانەی خۆشمان دەوێن وەکو ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان، ڕۆژوو گرتن گرینگیەکی تایبەتی پێ دراوە

لە ئیسلام وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿الصَّوْمُ لِي، وَأَنَا أَجْزِي بِهِ﴾[1] واتە: ڕۆژوو بۆ منەو منیش پاداشتەکەی ئەدەمەوە.

واتە خۆ گرتنەوە بە مەبەستی عیبادەت، و هەندێک جاریش بە ماڵ تاقی دەکرێتەوە وەکو زەکات دەرکردنی ماڵ و سامان ئەویش لە شەرع واجبێکە بە دەرکردنی ماڵێکی تایبەت بۆ کەسانێکی دیاری کراو لە کاتێکی تایبەت هەر کەسێکیش نەیدات تەمبێ دەکرێت و بە تۆبزی لێی وەردەگیرێت و هەر کەسێکیش مرد و زەکاتی نەدابێت لە میراتەکەی دەر دەکرێت، هەندێک جاریش تاقی دەکرێتەوە بەماڵ و لاشە وەکو حەج کردنی ماڵی خوای گەورە، کەواتە هەر کەسیک بەهەشتی دەوێت با نرخەکەی بدات و نرخەکەشی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای گەورەیە و خۆ بە دوورکردنەوە لە قەدەغە کراوەکانی، دەبێت بیزانین هیچ کەسێک ناچێتە ناو بازنەی ئیسلامەوە تاوەکو ئەو پێج شتانە جێبەجێ نەکات ئەگەر پێی کرا، و هەر کەسێکیش باوەڕی پێیان نەبێت یاخود ئینکاریان لێ بکات کافر دەبێت.

[1] - البخاری ژمارەی فەرموودە: ٧٥٣٨

# فەرموودەی (٢)

## یەکگرتنی باوەڕداران

**﴿عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾ قَالَ: إِنَّ الْمُؤْمِنَ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا وَشَبَّكَ أَصَابِعَهُ﴾**[١] واتە: لە هاوەڵی ئازیز باوکی موسا (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری سەروەرەوە ﴿ﷺ﴾ کە فەرموویەتی: بەڕاستی باوەڕدار بۆ باوەڕدار وەکو خشتی خانوو وان یەکتری دەبەستنەوە و پەنجەکانی لە یەکتر بەستەوە.

**ڕوونکردنەوە:** ئەم فەرموودە شیرینە فێرمان دەکات و هانمان دەدات بۆ ئەوەی باوەڕداران لە هاوکاری یەکتربن و پارچە پارچە نەبن چونکە هاوکاری کردنی باوەڕداران خوا پەرستیە و خوا پەرستنیش واجبە چونکە بە هاوکاری و یەکتر گرتن بەهێز دەبن و هەرگیز ژێر ناکەون.

بۆیە پێشەوامان ﴿ﷺ﴾ نموونەی بە دیوار هێناوەتەوە چونکە ئەگەر خشتەکان بەیەک نەگەن و یەکتر نەگرن خانووی لێ دروست نابێ و هیچ سوودێکیان نابێت بۆ خانووەکە.

کەواتە؛ بەیەک گرتنی ئیماندارارن خۆشەویستی خوای بێ هاوتا بەدەست دێنن.

[١] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٤٨١

هەر وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ﴾[1] واتە: خوای گەورە ئەوانەی خۆش دەوێت دەجەنگن لە پێناویدا و یەکتر دەگرن وەکو خشتی خانوو.

هەندێک لە موفەسرین تەفسیری (مَرْصُوصٌ) ئاوا دەکەن؛ یەکتر دەگرن وەکو مز (رساس) ئاوا توند و پتەون، بەڵام جێگای داخە ئەوەی لەم سەردەمە دەبیندرێت لە پەرتەوازە بوونی باوەڕداران.

کەوایە دەبێت بیزانین ئەمە پیلانی چەندها ساڵەی بێ باوەڕانە دایان ڕشتوە بۆ ئەوەی بەسەر ئوممەتی ئیسلام زاڵ بن، بەداخەوە کە لە پیلانەکەشیان سەرکەوتن و توانیان پەرتەوازەمان بکەن بۆ ئەوەی لاواز و زەلیلی بەردەستی دوژمنان ببین و حوکمان بکەن، بۆیە برایانم با بگەڕێینەوە بۆ ڕاستە شەقامی ئیسلام بۆ ئەوەی بزانین تام و لەزەتی دونیا و دوارۆژ چیە.

باوەڕداری ڕاستەقینە دەبێت ئاوابێت کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ﴿ليس المؤمنُ بالذي يشبعُ وجارُه جائعٌ إلى جنبَيْهِ﴾[2] واتە: باوەڕدار نیە ئەو کەسەی سکی تێربێت و دراوسێیەکەشی برسی بێت و بەخۆشی بیزانێت.

خۆشەویستانم زۆر لە خەڵکی منداڵەکانی ناخوێنن لە نەبونی یاخود جل و بەرگی بۆ منداڵەکانی پێ ناکڕێت لە نەبونی لەوانەشە ماڵی لە ناو چەند ماڵێکی

[1] - الصف/٤
[2] - صحيح الجامع/٥٣٨٢

بازرگان بێت خۆشیان بە باوەڕدار دەزانن، براکانم با سەیری هاوەڵانی پێغەمبەری ئازیزمان ﴿ﷺ﴾ بکەین وەکو نموونە: کاتێك پێغەمبەری سەروەرمان ﴿ﷺ﴾ کۆچکەران و پشتیوانانی کرد بە برا (عبدالرحمنی کردە برای سەعد (ڕەزای خوای تعالی یان لێ بێت) سەعد فەرمووی: براکەم من ماڵم زۆرە ماڵم دەکەم بە نیوە و دوو خێزانیشم هەیە کامەت بەدڵ بو بۆتی تەڵاق ئەدەم بۆ ئەوەی مارەی بکەی لە دوای تەواو بونی عیدەی، واش نەزانین تەنها ئەم هەڵوێستە لە یەک هاوەڵ ڕووی دابێت بابزانین هەڵوێستی هەموو هاوەڵان چۆن بووە لەگەڵ برا کۆچکارەکان، پێغەمبەری مەزن ﴿ﷺ﴾ بە پشتیوانانی فەرموو: با زەویەکانتان بۆ خۆتان بێت تەنها بەرو بومەکەی لەگەڵ کۆچکاران دابەش بکەن بەڵام لەو کاتەی ماڵ و سامانی بەنو نەزیری جولەکەکان کەوتە ژێر دەستی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە پشتیوانانی فەرموو: ماڵ و سەروەتی بەنو نەزیر لە نێوان ئێوە و کۆچکاران دابەش بکەم؟ بەڵام کۆچکاران هەر لەگەڵتان هاوبەش بن لە زەویەکانتان یاخود با کۆچکاران واز لە زەویەکانتان بهێنن بەڵام سامانی بەنو نەزیر تەنها لە نێوان کۆچکاران دابەش بکەم پشتیوانان فەرموویان نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ماڵی جولەکەکان تەنها لە نێوان کۆچکاران دابەش بکە و با لەگەڵ ئێمەش هاوبەش بن لە زەویەکانمان.

واللّٰە جێگای خۆیەتی بۆ خۆمان بگرێین ئێمە چەند لەم برایەتیە دوور کەوتوینەتەوە لەوانەیە ئەم جۆرە نموونانە بۆ ناپیاوان و نامەردان نامۆ بێت،

چونکە ئەم کارانە تەنها لە پاڵەوانانی ئیسلام دەوەشێتەوە. کەواتە ئازیزەکانم کە دەبینین موسوڵمانان لە هەموو دونیا لاواز و ژێر دەستەن با پێمان سەیر نەبێت چونکە ئەمە بەروبومی کردەوەکانمانە ئەمە یاسای خوای گەورەیە هەر کاتێک سەرپێچی خوای باڵا دەست و پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾ کرا هەر شتێکمان بەسەر بێت گومانتان نەبێت شایەنی خراپترین، بەڵام بەزەیی خوایە سزای کەمێک لە هەڵە و تاوانەکانمان دێنێتەوە ڕێگامان؛ با بزانین لەبەر سەرپێچی یەک فەرمانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ خوا سوپای ئیسلامی سزادا لە جەنگی ئوحود هاوەڵان پێیان سەیربوو گوتیان: ﴿أَنَّى هَذَا﴾ خوای گەورە بە پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾ فەرموو: ﴿قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ﴾[1] واتە: پێیان بڵێ: ئەو بەڵایە لەلایەن خۆتانەوە توشتان هات (کاتێک سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەرتان کرد)

کەواتە، ئەگەر بمانەوێت سەر بەرزی و سەر فرازی دونیا و دواڕۆژ بەدەست بهێنین با ملکەچی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی بین ﴿ﷺ﴾ بۆ ئەوەی شایەن و شایستەی بەزەی خوای گەورە بین، چونکە ﴿إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ﴾[2] واتە: بەڕاستی ڕەحمەتی خوای گەورە نزیکە لە چاکەکاران و چاکەخوازانەوە. داوامان لەخاوەنی دڵەکانمانە دڵمان بکاتە یەك دڵ تەنها لەپێناو خۆی و دینەکەی ئامین

[1] - آل عمران(١٦٥)

[2] - الاعراف ٥٦

# فەرموودەی (٣)

# لاإله إلاالله بەڵگەیە لە دوارۆژدا

**﴿قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ لِأَبِي طَالِبٍ يَا عَمِّ، قُلْ لَاإِلَهَ إِلَّااللَّهُ كَلِمَةً أَشْهَدُ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ﴾**[1] واتە: پێغەمبەری خۆشەویست ﴿ﷺ﴾ ڕۆیشت بۆ لای ئەبوتالیبی مامی لە کاتی سەرە مەرگدا بوو، زۆر هەوڵی دا بۆ ئەوەی شایەتومانی پێ بێنێت و دەیگوت: مامە بڵێ (لاإله إلاالله) بۆ ئەوەی بتوانم بەهۆیەوە شاهیدیت بۆ بدەم لای خوای گەورە.

**ڕونکردنەوە:** واتە، ئەگەر مرۆڤ پێشی مردنی وشەی تەوحید دەربڕێت بۆی دەبێتە بەڵگە بۆ ئەوەی ببێتە بەربەستێک لە ئاگری دۆزەخ و ببێتە هۆکاری بەدەست هێنانی تکا و شەفاعەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ چونکە ئەگەر سوودی نەبوایە ؟ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هەوڵی لەگەڵ مامی نەدەدا، بەڵام با هەوڵ بدەین لە کار و کردەوەمان واتای (لاإله إلاالله) ڕەنگ بداتەوە چونکە بەڕاستی ئەگەر مرۆڤ لە ژیانیدا کردار و گوفتاری لە چوارچێوەی (لاإله إلاالله) نەبوبێت زۆر ئەستەمە لەسەرە مەرگدا بتوانێت ئەم وشە پیرۆزە ئاوا بە ئاسانی دەربڕێت و بێتە سەر زوبانی، کەواتە با زۆریش ئاگاداربین نەوەک گوفتارێك دەر ببڕین و

---

[1] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ١٣٦٠

بەکرداریش هەڵیبوەشێنینەوە وەکو ئەو ئافرەتەی لە دوای ماندوبونێکی زۆر بە ئاسانی کار و کردارەکانی خۆی هەڵدەوەشاندەوە، هەر وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَا تَكُونُوا كَالَّتِي نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِن بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَاثًا﴾[1] واتە: وەکو ئەو ئافرەتە مەبن کە ڕیسەکەی دەکردەوە بە خوری، دوای ڕستن و تۆکمەکردنی هەڵی دەوەشاندەوە.

چونکە هەندێک کردار هەیە پێچەوانەی وشەی (لاإله إلاالله) یە، کەواتە دەبێت هەوڵ بدەین واتای (لاإله إلاالله) لە کار و کردەوەکانمان ڕەنگ بداتەوە و خۆشمان بەناو و ناتۆرە هەڵمەکێشین چونکە تەنها کەسێک سەرفەراز دەبێت لە ژێر وشەی (لاإله إلاالله) ژیان خۆی بباتە سەر، چونکە زۆرێک لە خەڵک شەیتان فێلی لێ کردونە، واشدەزانێت موسوڵمانی ڕاستەقنە هەر بەخۆیەتی، هەر وەکو خوای باڵادەست فەرمویەتی: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ۞ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ۞ أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا﴾[2]واتە: بڵێ ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە زەرەرمەن ترین کەس؟ ئەوانەن لەژیانی دونیایاندا گومڕا بونە و واش گومان دەبەن بەڕاستی ئەوان کارێکی زۆر چاك دەکەن ئەوانە کەسانێکن بێ باوەڕ بوون بە نیشانەکانی پەروەردگاریان و گەیشتن بە

---

[1] - النحل ٩٢
[2] - الكهف ١٠٣ - ١٠٥

خزمەتی خوای گەورە لە دوارۆژدا بۆیە کردەوەکانیان پوچەڵ و بێ نرخ بوو، کەواتە لە ڕۆژی دوایی دا هیچ نرخ و ڕێزێکیان بۆ دانانێین.

دەبێت بیزانین ئەوەی مابەینی بەندە و خوای گەورهیە، تەنها تەقوایە، چونکە خوای گەورە بەپێغەمبەرە نازدارەکەی ﴿ﷺ﴾ فەرمووە:

﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاء﴾[1] واتە: بەڕاستی ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ تۆ ناتوانی ئەو کەسانەی خۆشت دەوێن ڕێنوێنی بکەیت بەڵام خوای گەورەیە هیدایەتی کەسانێک دەدات کە ویستی خۆی لەسەر بێت.

ئەم فەرموودەش فێرمان دەکات وشەی (لاإله إلاالله) سوودی بۆ بێ باوەڕیش هەیە ئەگەر لەسەرە مەرگ بتوانێت دەریببڕێت، بەڵام ناتوانن دەر ببڕن. بزانە ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە جەنگ پیاوێکی کوشت لە دوای ئەوەی کە گوتی: (لاإله إلاالله)پێغەمبەری سەروەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ﴿أَقَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَقَتَلْتَهُ؟ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا قَالَهَا خَوْفًا مِنَ السِّلَاحِ. قَالَ: أَفَلَا شَقَقْتَ عَنْ قَلْبِهِ حَتَّى تَعْلَمَ أَقَالَهَا أَمْ لَا؟﴾[2] واتە: ئایا گوتی: (لاإله إلاالله) و کوشتت؟ ئوسامە فەرمووی: ئەی خۆشەویستی خوا: لە ترسی شمشێر گوتی: پێغەمبەری دڵسۆز ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئایا دڵیت شەق کرد بۆ ئەوەی بزانی لەبەر چی گوتی.

---

[1] - القصص ٥٦

[2] - مسلم ژمارەی فەرموودە: ٩٥

کەواتە هەر کەسێك کۆتا وشەی (لا إله إلاالله) بێت حوکمی موسوڵمانی بۆ بڕیار دەدرێت، واتە لە شوشتن و کفن کردن و ناشتنەوە.

چونکە ئێمە ئیش لەسەر ڕوالەت دەکەین، وەکو پێغەمبەر

بۆیە پێغەمبەری مەزن ﴿ﷺ﴾ بە مامەکەی فەرموو: بڵێ (لا إله إلاالله) بۆ ئەوەی بتوانم شەفاعەت و تکات بۆ بکەم، بەڵام نەیتوانی دەرببڕێت.

داوامان لە پەروەردیگاری جیهانیانە کە کۆتا وشەمان لەژیاندا (لا إله إلاالله) بێت بۆ ئەوەی بەڕویکی سپی و بەسەرفرازی بگەڕێینەوە ساحەی مەحشەر و حیساب و لە دواڕۆژیشدا لە ژێر پەیداخی (لاإله إلاالله) حەشر بکرێن بە ویستی خوای تعالی ئامین.

# فەرموودەی (٤)

# مافی اللَّه چیە؟ مافی بەندە چیە؟

﴿عَنْ مُعَاذٍ (رضي الله عنه) قَالَ : كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾ عَلَى حِمَارٍ يُقَالُ لَهُ عُفَيْرٌ، فَقَالَ (يَا مُعَاذُ، هَلْ تَدْرِي حَقَّ اللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ؟ وَمَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ ؟ قُلْتُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ فَإِنَّ حَقَّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلَا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَحَقَّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ أَنْ لَا يُعَذِّبَ مَنْ لَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلَا أُبَشِّرُ بِهِ النَّاسَ؟ قَالَ لَا تُبَشِّرْهُمْ فَيَتَّكِلُوا﴾[1]

واتە: لە هاوەڵی زۆر بەڕێز موعازی كوری جەبەل (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) دەگێڕێتەوە كە لە پشت پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ سوار بووبووم لەسەر وڵاخەكەی كە ناوی عوفەیر بوو خۆشەویستی خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەی موعاز دەزانی مافی خوای گەورە لەسەر بەندەكانی چیە؟ و مافی بەندەكانیش لەسەر خوای گەورە چیە؟ گوتم: خوای گەورە پاشان پێغەمبەرەكەی ﴿ﷺ﴾ دەزانن فەرمووی: مافی خوای باڵا دەست لەسەر بەندەكانی ئەوەیە بیپەرستن و هیچ هاوەڵێكی بۆ بڕیار نەدەن، و مافی بەندەكانیش لەسەر خوای گەورە ئەوەیە كەسێك سزا نەدات ئەگەر هاوەڵ دانەر(موشریك) نەبێت موعاز دەفەرمووێت:

[1] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٢٨٦٥

گۆتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ موژدە بدەم بە خەڵک؟ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: نەخێر چونکە واز لە کردەوە دەهێنن.

**ڕوونکردنەوە:** کەواتە، دەبێت بزانین بەهەشت مافی بەندەکانە ئەگەر موەحید بن و پارێزگاری بکەن لە تەوحیدی خۆیان، بەڵام ئەو کەسەی بەهەشتی بوێت و داوای مافی خۆی بکات دەبێت نرخەکەی بەهەشت بدات و ئەرکەکەی خۆی جێبەجێ بکات ئەر کەکەشی بریتیە لە یەکخوا پەرستی، ئەویش مافی خوایە بەسەر بەندەکانی کە کار و کردەوەش بە واتا و مەبەستی (لاإله إلاالله) بکەن و بە کرداریش بیسەلمێنن و دیار بن لە ناو خەڵک کە بەندەی هیچ کەس و شتێک نین، تەنها بەندەی خوای گەورەنە، چونکە شیرک و هابەشدانان زۆر ترسناکە بۆیە پێویستە ئاگاداری بین نەوەک توشی بین و بکەوینە ناوی لە یەکێک لە پێشەواکانی سەلەف دەگێڕنەوە کە ڕۆژێک چووە ناو قوتابیەکانی بێزاری پێوە دیاربوو، قوتابیەکان گۆتیان: خێرە مامۆستا؟مامستا فەرمووی: زانیومە لە دەرەوی شار پیاوێک خانوێکی دورست کردوە و کەلەشێرێکی لە پێش دەرگاکە سەربڕیوە لەبەر چاوزار، قوتابیەکانیش زۆر بێتاقەت بوون، مامۆستاکە فەرمووی: سەبرتان هەبێت کەسێکم ناردوە بۆ دڵنیابون چونکە لەوانەیە هەواڵەکە ڕاست نەبێت، بوە بەیانی مامۆستاکە گەڕاوە ناو قوتابیەکان گۆتیان: مامۆستا چی بوو؟ مامستا فەرمووی: هەواڵەکە ڕاست نەبوو کەلەشێری سەر نەبڕی بوو بەڵام یەکەم کاری لە ناو خانوەکە ئەنجام دابوو زینای لەگەڵ

دایکی کردبوو، قوتابیەکان زۆر پێ تێکچون و گۆتیان مامۆستا چۆن دەبێت لێی بێ دەنگ بین مامۆستاکەش فەرمووی: ئێوە تاوەکو ئێستا لە واتای تەوحید تێنەگەیشتونە، چونکە شیرک زۆر لە زینا کردن لەگەڵ دایک گەورەترە.

کەواتە، شیرک و هاوبەشدانان زۆر خەتەرناکە خوای گەورە قەت لێت خۆش نابێت ئەگەر شیرک ئەنجام بدەی ئەگەر ئەو کەسە پێغەمبەریش بێت.

هەر وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾[١] واتە: بەڕاستی نیگامان بۆ تو و بۆ پێغەمبەرانی تری پێش توش کردوە ئەگەر شیرک ئەنجام بدەن هەموو کردەوەکانتان پوچەڵ دەبێتەوە و لە دوا ڕۆژیشدا لەزەرەرمەندان دەبی.

کەواتە خۆشەویستان با تەوحید و یەکخواپەرستی لە هەڵسوکەوتمان ڕەنگ بداتەوە ئەویش بەوە دەبێت کە فەرمانی هیچ کەس و شتێك بەسەر فەرمانەکانی خوای گەورە نەخات بۆ ئەوەی گۆتنی اللَّه أكبری بە گوفتار لەگەڵ کردارەکانی یەك بگرێتەوە چونکە ئەو کەسەی فەرمانی کەسێک پێش فەرمانەکانی خوای گەورە بخات نەیگوتوە اللَّه أكبر ئەگەر هەزار جاریش بە گوفتار بڵێت و دەریببڕێت، داوام وایە لە خوای تعالی هاوکاریان بکات بۆ ئەوەی بژین لەسەر تەوحید و بشمرین لەسەر تەوحید و حەشریشمان لەکەڵ موەحیدان بێت.

ئامین

---

[١] - الزمر٥٦

## فەرمووودەی (٥)

## چێشتنی تامی باوەڕ

﴿عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾ قَالَ: ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ، أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ﴾[١]

واتە: لە هاوەڵی زۆر خۆشەویست ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: سێ شت هەر کەسێک لێی بێتە دی تام و شیرینی باوەڕ چێشتوە.

(١)خوای گەورە پاشان پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾ لە هەموو شتێکی خۆشتر بوێیت.

(٢)کەسێکی خۆش بوێت بەبێ هیچ بەرژەوەندییێک تەنها لە پێناو خوای گەورە

(٣)پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ کوفر و بێ باوەڕی هەر وەکو پێی ناخۆشە بخرێتە ناو ئاگرەوە.

**ڕوونکردنەوە:** واتە، بیروباوەڕ تام و لەزەتی خۆی هەیە بەڵام کەمێک لە خەڵک چێشتویەتی ئەویش باوەڕداری ڕاستەقینەیە زۆربەی خەڵک تەنها تام و شیرینی

[١] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ١٦

خۆراکیان کردوە چونکە هەر بۆ ئەوەیان هەوڵداوە، بەڵام بەندەی ڕاستەقینە ئەگەر تام و لەزەتی باوەڕی چێشت بە هەموو گەردون نایگۆڕێتەوە.

بۆیە إبراهيم ابن أدهم، رحمەالله، فەرمویەتی: **(لو علم الملوك و أبناء الملوك ما نحن فيه من السرور والنعيم إذًا لجالدونا عليه بالسيوف)**[1] واتە: ئەگەر پادشا و کوڕە پادشاکان بیانزانیبا ئێمە لەچ نیعمەت و خۆشیەکداین، بەشمشێر لێیان وەردەگرتین.

یەکەم شتیش ببێتە هۆکاری چێشتنی باوەڕ، خۆشویستنی خوای گەورەیە پاشان پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ ئەویش چەندەها نیشانەی هەیە، لە نیشانەکان زیکر و یادی خوایە بە گوفتار و لاشە و نیەت و مەبەستی.

واتە: ئەو بەندەیە نایەوێت کەس تێکەڵی نێوان خۆی و خوای بێ هاوتا ببێت، یەکێک لە پێشینانی ئەم ئوممەتە پێیان گۆت: بۆ نوێژی سوننەت لە مزگەوت ناکەی فەرمووی: واللّٰه ئەگەر پێم بکرابا کردارەکانم لەفریشتەکانی سەر شانم دەشاردەوە.

واتە، تەنها مەبەستی چاککردنی نێوان خۆی و خوای گەورە بووە، و باوەڕداریشی خۆش بوێت بەبێ بەرژەوەندی تەنها لەپێناو خوای گەورە، چونکە ئەو باوەڕدارە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای باڵا دەست و پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ هەروەکو پێغەمبەری پێشەوا ﴿ﷺ﴾فەرموویەتی: خوای گەورە لە فەرموودەیەکی

---

[1] - حلية الأولياء(٧/ ٣٧٠)

قودسی فەرموویەتی: ﴿الْمُتَحَابُّونَ فِي جَلَالِي لَهُمْ مَنَابِرُ مِنْ نُورٍ يَغْبِطُهُمُ النَّبِيُّونَ وَالشُّهَدَاءُ﴾[1] واتە: ئەوانەی لە پێناو منەوە یەکتریان خۆش ویستوە میمبەرێکیان بۆ هەیە لە نوور، کە پێغەمبەران و شەهیدەکان ئاوات بەم شوێنە دەخوازن.

واللَّه پەرستنێکی ئاسانە بۆ کەسانی دڵ پاک و پاداشتێکی زۆر گەورەیە، خوای گەورە پێمانی ببەخشێت، و سوتان بە ئاگری زۆر لای ئاسانتر بێت لە وازهێنانی لە بیر و باوەڕیەوە. بۆیە هاوەڵانی خۆشەویستمان بەرگەی هەموو جۆرە ئازارێکیان دەگرت، بەڵام پاشگەز نەدەبونەوە لە باوڕەکەیان چونکە تامی باوەڕیان چێشتبوو، باوەڕ تەنها گوفتار نیە بەڵکو کردار و هەڵسو کەوتە، باوەڕ تامو چێژی هەیە، هەر وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ﴾[2] واتە: خوای گەورە نموونەی باوەڕی هێناوە بە نموونەی درەختێکی بەردار و بەتامو چێژەوە. بەڵام ئەوکەسە هەستی پێ دەکات کە بەتەواوەتی پەروەردیگاری خۆی ناسی بێت، کەواتە، هەرکەسێک تامو چێژی لە پەرستنی خوای گەورە نەکرد با لە خۆی بترسێت و بەخۆیدا بچێتەوە چونکە یەکێک لە سزاکانی خوای گەورە ئەوەیە وا لە بەندەکەی دەکات هێچ تام و چێژ لە عیبادەت و پەرستەکانی نەکەت، پەنا بە خوای گەورە، داوامان لە خوای باڵا دەستە تام و چێژی پەرستنما پێ ببەخشێت. ئامین

[1] - الترمذي/٢٣٩٠

[2] - إبراهيم ٢٤

# فەرموودەی (٦)

## ئاگادار کردنەوە لە شیرك

﴿حَدَّثَنِي أَبُو أَيُّوبَ (رضي الله عنه)، أَنَّ أَعْرَابِيًّا عَرَضَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ وَهُوَ فِي سَفَرٍ، فَأَخَذَ بِخِطَامِ نَاقَتِهِ، أَوْ بِزِمَامِهَا، ثُمَّ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوْ يَا مُحَمَّدُ، أَخْبِرْنِي بِمَا يُقَرِّبُنِي مِنَ الْجَنَّةِ، وَمَا يُبَاعِدُنِي مِنَ النَّارِ. قَالَ فَكَفَّ النَّبِيُّ ﴿ﷺ﴾، ثُمَّ نَظَرَ فِي أَصْحَابِهِ، ثُمَّ قَالَ(لَقَدْ وُفِّقَ، أَوْ لَقَدْ هُدِيَ) قَالَ كَيْفَ ؟ قُلْتَ قَالَ فَأَعَادَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﴿ﷺ﴾ تَعْبُدُ اللَّهَ لَا تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصِلُ الرَّحِمَ، دَعِ النَّاقَةَ﴾[1] واتە: لە هاوڵی خۆشەویسەوە ئەبو ئەیوب (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) فەرموویەتی: دەشتەکیێک هاتە پێش پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ لە سەفەرێکیدا قەراستەی وشترەکەی پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾ گرت و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ شتێکم پێ بڵێ نزیکم بکاتەوە لە بەهەشت و دورم بخاتەوە لە ئاگر ئەوجا خۆشەویستی خوا ﴿ﷺ﴾ تەماشای هاوەڵانی کرد و پاشان فەرمووی: بەڕاستی ڕێنوێنی کرا گوتیان چۆن؟ فەرمووی: خوا بە تاك بپەرستە و هاوەڵی بۆ بڕیار مەدە و نوێژ بکە و زەکاتی ماڵەکەت دەر بکە و پەیوەندی خزمەکانت مەپچڕێنە وشترەکە بەردە.

---

[1] - مسلم ژمارەی فەرموودە: ١٣

**ڕوونکردنەوە:** بەڕاستی ئەو فەرموودەیە مەترسی و ترسناکی شیرک و هاوبەشدانان بۆ خوای گەورە دەر دەخات چونکە شیرک لەناو بەری هەموو خێر و چاکەکانە هەر وەکو خوای گەورە لە قورئاندا لە سوڕەتی الانعام لە ئایەتی ٨٣ تاکو ٨٦ بۆمان باسی (١٨) پێغەمبەر دەکات و لە کۆتایی دە فەرمووێت: ﴿وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[١] واتە: ئەگەر بێت و شیرکیان لەگەڵ خوا بڕیار بدابا ئەوە هەمو کارەکانیان پوچەڵ دەبوو.

کەواتە، خوای گەورە شیرک لە کەس قبول ناکەت ئەگەر ئەو کەسە پێغەمبەریش بێت چونکە خوای گەورە بێ نیازە لە پەرستنی بەندەکان هەروەکو لەسەر گوفتاری پێغەمبەر موسی علیه‌السلام بە ئوممەتەکەی دەفەرمووێت: ﴿إِن تَكْفُرُوا أَنتُمْ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾[٢] واتە: ئەی موسی پێیان بڵێ ئەی گەڵەکەم ئەگەر ئێوە و هەموو ئەوانەی لەسەر زەوین بێ باوڕ بن بەڕاستی خوای تعالی بێ نیازە لێتان.

کەواتە، با بەخۆماندا بچینەوە و دەست بە تەوحیدەوە بگرین و وشیار و ئاگادار بین لەو تاوانانەی دەبێتە هۆی سڕینەوەی چاکەکانمانە بە تایبەتیش شیرک و هاوبەش دانان پەنا بەخوا، براکانم هەموو پەرستنێک هەڵوەشێنەری هەیە، هەندێ کردەوە هەیە دەست نوێژ دەشکێنن هەندێک کردەوە هەیە نوێژ بەتاڵ

---

[١] - الأنعام ٨٨

[٢] - ابراهیم ٨

دەکاتەوە هەندێک شت هەیە ڕۆژو بەتاڵ دەکاتەوە بە هەمان شێوە هەندێک کار و کردەوە هەیە، باوەڕ هەڵدەوشێنێتەوە کەواتە، باخۆمان شەرمەزاری مەحشەر نەکەین واللّٰە ڕیسوا بونە ئەگەر بیری لێ بکەینەوە ئەم هەموو پێغەمەرە ئەم هەموو سحابە ئەم هەموو زانایانە لەسەر هەر هەمووشیان خوای گەورە ئەمادەیە لە قیامەت تۆش بە بارێک تاوان و سەرپێچی بگەڕێیەوە، چونکە شەرمەزاری قیامەت زۆر گەورەیە خوا بمان پارێزێت، کەواتە، با لەو کەسانە نەبین خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموویت: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا(١٠٣) الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا(١٠٤)أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا﴾[1] واتە: ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بڵێ ئایا پێتان بڵێم: زیانبارترین کەس لای خوا کێیە؟ ئەوانەن کە هەوڵ و تێکۆشانەکانیان لە ژیانی دونیادا کارەکانیان بە بێ ڕێنوێنی ئەنجام دەدا، چونکە بێ بڕوابوون و هەرچیان کردبێ لێیان وەرنەگیراوە (ئیمامی تەبەریی) دەڵێت: ئەم هەڕەشەیە تەواوی خەڵکانی بیدعەچیی و، خاوەن بیروباوەڕە گەندەڵ و چەواشە کاریەکان دەگرێتەوە، ﴿وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا﴾ لەگەڵ ئەوەشدا لایان وایە کارێکی شیاو و شایستەیان ئەنجام داوە.

کەواتە، دینداری ئەوەنیە بە ئارەزووی خۆمان ئەنجامی بدەین،

[1] - الكهف ١٠٣-١٠٥

بەڵکو دینداری گوێڕایەلی خوا پاشان پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ بەو ڕێبازەی بۆمان ڕوونکراوەتەوە ئینجا پارێزگاریشی لێ بکەین، نەوەک پوچەڵی بکەینەوە بەکردارێک یاخود بە گوفتارێک چونکە قسەی وا هەیە خاوەنەکەی شایەستەی خەشم و قینی خوای گەورە دەکات، بزانە پێغەمبەری مەزن ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت:

**﴿إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللَّهِ لاَ يُلْقِي لَهَا بَالاً يَهْوِي بِهَا فِي جَهَنَّمَ﴾**[١]

واتە: کەسی وا هەیە وشەیەکی وا دەر دەبڕێت لە خەشمی خوا هەر گوێشی نادەتێ بەهۆیەوە فڕەدەدرێتە دۆزەخ.

پەنا بەخوای گەورە کەواتە با پارێزگاری لە چاکەکانی خۆمان بکەین بە تەوحید، لە کۆتایی داوامان لە خالقی بێ هاوتایە، لەسەر تەوحید بمان ژیێنێت و هەر لەسەر تەوحیدیش بمان مرێنێت و بەموەحیدیش حاشرمان بکات، ئامین.

[١] - البخاری ژمارەی فەرموودە: ٦٤٧٨

# فەرموودەی (٧)

## فێربوونی تەوحید پێش هەموو شـتێك

﴿عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ(رضي الله عنه)، قَالَ : كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾ وَنَحْنُ فِتْيَانٌ حَزَاوِرَةٌ، فَتَعَلَّمْنَا الْإِيمَانَ قَبْلَ أَنْ نَتَعَلَّمَ الْقُرْآنَ، ثُمَّ تَعَلَّمْنَا الْقُرْآنَ، فَازْدَدْنَا بِهِ إِيمَانًا﴾[١]

واتە: لە هاوەڵی بەڕێزەوە جوندوبی کوڕی عبداللَّه (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) دەفەرمووێت: لە خزمەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئێمە منداڵانێکی بەهێز بوین یەکەم جار فێری عەقیدە و باوەڕ بوین لە پاشان فێری قورئان بوین ئیمان و باوەڕمانی پێ زیادبوو.

**ڕوونکردنەوە:** دەبێت زۆر گرینگی بە بواری عەقیدە و بیروباوەڕ بدەین بۆ ئەوەی ببێتە بناغەیەکی وا کە هەموو پەرستنەکانی تری لەسەری دابمەزرێنین لەوانەیە کەسێک بڵێت باشە قورئان هەموو ئاینی ئیسلامی لە خۆی نەگرتوە؟ چۆن فێری باوەڕ ببم پێشی فێربونی قورئان؟ دەڵێن مەبەستی ئەم هاوەڵە بەڕێزە ئەوەیە کە فێری واتا و مەبەستی قوڕئان گرینگترە لە خوێندنەوەی، کەواتە ئازیزەکانم ئێمە ئەگەر فێری واتا و مەبەستی قوڕئان بوین بۆ ئەوەی لە پاشان کە دەقی قوڕیانمان خوێندەوە واتاکەی زیاتر جێگیر ببێت لەدڵماندا، واتە،

---

[١] - آبن ماجە٦١

قورئان بەکارو کردەوە بسەلمێنین و ڕەنگ بداتەوە لە هەڵسوکەوتمان هەر وەکو دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) بۆمان باسی خۆشەویست دەکات و دەفەرموویت: ﴿كَانَ خُلُقُهُ ٱلقرآن﴾[1] واتە: ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) قورئان بوو.

واتە: بە گوێرەی فەرمانەکانی قورئان بووە هەڵسوکەوتەکانی، کەواتە برایان دەبێت تێگەیشتن و شارەزابونمان لە قورئان، ببێتە مایەیی زیاد بوونی ئیمان و باوەڕمان، ئەویش بەوە دەبێت باوەڕ و عەقیدەیەکی پتەومان هەبێت ئەوجا فێری قورئان ببین بۆ ئەوەی ببێتە هۆی بەرزبونەوەی باوەڕمان هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ لە وەسفی بڕواداران کاتێک قورئانیان بۆ دەخوێندرێت ئیمانیان پێ زیاد دەکات. ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا﴾[2]

کەواتە، قورئان دەبێتە هۆکاری بەرزکردنەوەی پلەی ئەو کەسانەی کە بیانەوێت بەرز ببنەوە، با دەستی پێوە بگرین خۆشەویستان بۆ ئەوەی پەیوەندیمان لەگەڵ اللّٰه نەپچڕێت چونکە قورئان تامو لەزەتێکی تایبەتی هەیە بەڵام بۆ کەسانێک بەگوێی دڵی بیسەری بێت هەر وەکو، وەلیدی کوڕی موغیرە دەڵێت لەوەسفی قورئان لەو کاتەی پێغەمبەری مەزن (ﷺ) بۆی خوێندەوە دەڵێت:

﴿واللّٰه لقد سمعت من محمد آنفاً كلاماً؛ ما هو من كلام الأنس ولا من كلام الجن؛ واللّٰه إنَّ له لحلاوة، وإنَّ عليه لطلاوة، وإنَّ أعلاه لَمُثمِر، وإنَّ أسفَلَهُ

---

[1] - أحمد ٢٥٣٠٢

[2] - الأنفال ٢

**لَمُغدِق، وإنّه يعلو ولا يُعلى عليه﴾**[1] واتە: سوێند بە خوا بەراستی ئێستا قسەیەکم لە موحەممەد ﴿ﷺ﴾ بیست قسەی مرۆڤ نەبوو و قسەی جنۆکەش نەبوو واللَّه شیرینییەکی هەبوو و ڕەونەق و جوانێکی لەخۆی گرتبوو سەرەکەی بەرداره و ژێرەکەی زۆر فرەوانە و بەرز دەبێتەوە و هیچ شتێکیش لەسەری بەرز نابێتەوە. خۆشەویستان ئەگەر کافرێک ئاوا قورئان کاریگەری تێ بکات جێگای خۆیەتی بزانین چ شتێکە وای لێمان کردوە قورئان کاریگەریمان تێدا ناکات، چونکە ئەگەر قورئان کاریگەری لەسەرمان نەبوو دەبێت بە خۆمان دابچینەوە بۆ ئەوەی پەشیمان نەبینەوە لەو ڕۆژەی کە پەشیمانی سوودی نییە پەنا بەخوای گەورە.

[1] - تفسير البغوي

# فەرموودەی (٨)

# دڵسۆزی

﴿قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَ عَلَى النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ؛ يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ﴾[١]

واتە: بەڕاستی خوای گەورە ئەو کەسەی حەرام کردوە لەسەر ئاگر بڵێت (لاإله إلا اللّه) تەنها مەبەستیشی خوا بێت.

**ڕوونکردنەوە:** بەڵام دەبێت کارو کردەوەی بەواتاکەی بکات و هەموو مەرجەکانی جێبەجێ بکات، واتە، تەوحید لەسەروی هەموو کاروکردەوەیەکە بەڵکو بگرە بناغەی هەموو کردەوە چاکەکانە، بەڵام بە هەڵە لەم فەرموودە نەگەن واز لە کاروکردەوە بهێنن وەکو گرووپی مورجیئەکان، چونکە چاکی مرۆڤ بە گوێرەی کردارەکانیە هەروەکو خۆشەویسمان فەرموویەتی:

﴿اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ﴾[٢]

واتە: کار بکەن چونکە ئەوەی باش بێت کاری باشی بۆ ئاسان دەبێت و ئەوەی خراپ بێت لەکاری خراپ بەردەوام دەبێت. (پەنا بەخوا).

---

[١] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٤٢٥

[٢] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٤٩٤٩

دەبێت بناغەی دینمان تەوحید بێت و بە ئیخڵاسیەوە بێت جونکە شەیتانی نەفرەت لێ کراو پیلانەکانی گەڵێك زۆرن ئەگەر هیچی لەگەڵ موسوڵمان پێ نەکرێ کار و کردەوەی بۆ دەڕازێنتەوە و سەرسام دەبێت بەخۆی لە کۆتاییش توشی ڕیابازی دەکات بۆ ئەوەی کار و کردەوەکانی مایە پوچ ببێت، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ﴾[1] واتە: پیاوی واهەیە کار و کردەوەی ئەهلی بەهشت دەکات بەڵام لە بەر چاوی خەڵک ئەو کارە چاکە و باشە بەڵام لەناوە ڕۆکدا وانیە چونکە بۆ ناوبانگ بووە و ئیخلاسیان نەبوە بۆ خوا.

بەڕاستی ئەم فەرموودەیە بەسە بۆمان ببێتە دەرس و وانە کە نیەتەکانمان پاک بکەینەوە و کار و کردەوەکانمان بۆ ئەو زاتە بێت کە نهێنی وئاشکەراکان لای ئەو وەکو یەکە.

ئەوجا خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ لە ڕێگای سحابەکانی ئاگاداری ڕیامان دەکاتەوە و بۆمان باسی سیفاتی سێ کەس دەکات کار و کردەوەی باشیان کردوە لە دونیا بەڵام چونکە ئیخڵاسی تێدانەبووە، کە یەکێکان لە جیهاد کوژراوە، ئەویتریشیان زانا و قورئان خوێن بووە و ئەویتریشیان دەوڵەمەند بووە و ماڵ و سامانی بەخشیوە، بەڵام زۆر بەداخەوە بۆ ڕەزامەندی خوای نەبووە چونکە زۆرێک لە خەڵک کاری چاکە دەکات بەلام تەنها لە بەر چاوی ئێمە چاکە، هەر وەکو

---

[1] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٢٨٩٨

خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: ﴿أَنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ يَنْزِلُ إِلَى الْعِبَادِ لِيَقْضِيَ بَيْنَهُمْ، وَكُلُّ أُمَّةٍ جَاثِيَةٌ، فَأَوَّلُ مَنْ يَدْعُو بِهِ رَجُلٌ جَمَعَ الْقُرْآنَ، وَرَجُلٌ قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَرَجُلٌ كَثِيرُ الْمَالِ، فَيَقُولُ اللَّهُ لِلْقَارِئِ : أَلَمْ أُعَلِّمْكَ مَا أَنْزَلْتُ عَلَى رَسُولِي ؟ قَالَ : بَلَى يَا رَبِّ. قَالَ : فَمَاذَا عَمِلْتَ فِيمَا عُلِّمْتَ ؟ قَالَ : كُنْتُ أَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ. فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: كَذَبْتَ. وَتَقُولُ لَهُ الْمَلَائِكَةُ : كَذَبْتَ. وَيَقُولُ اللَّهُ : بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ : إِنَّ فُلَانًا قَارِئٌ، فَقَدْ قِيلَ ذَاكَ. وَيُؤْتَى بِصَاحِبِ الْمَالِ فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ : أَلَمْ أُوَسِّعْ عَلَيْكَ حَتَّى لَمْ أَدَعْكَ تَحْتَاجُ إِلَى أَحَدٍ ؟ قَالَ : بَلَى يَا رَبِّ. قَالَ : فَمَاذَا عَمِلْتَ فِيمَا آتَيْتُكَ ؟ قَالَ : كُنْتُ أَصِلُ الرَّحِمَ وَأَتَصَدَّقُ. فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ : كَذَبْتَ. وَتَقُولُ لَهُ الْمَلَائِكَةُ : كَذَبْتَ. وَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى : بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ: فُلَانٌ جَوَادٌ، فَقَدْ قِيلَ ذَاكَ. وَيُؤْتَى بِالَّذِي قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ : فِي مَاذَا قُتِلْتَ ؟ فَيَقُولُ : أُمِرْتُ بِالْجِهَادِ فِي سَبِيلِكَ، فَقَاتَلْتُ حَتَّى قُتِلْتُ. فَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى لَهُ : كَذَبْتَ. وَتَقُولُ لَهُ الْمَلَائِكَةُ: كَذَبْتَ. وَيَقُولُ اللَّهُ: بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ : فُلَانٌ جَرِيءٌ. فَقَدْ قِيلَ ذَاكَ﴾[١]

واتە: خـوای گەورە لە ڕۆژی دوای دێـت بـۆ حـوکم کـردن لە نێـوان بەنـدەکان یەکەم کەس بانگ دەکرێت قورئان خوێنە پێی دەفەرمووێت: ئایا تـۆم فێـرە ئەوە نەکرد کە بۆ پێغەمبەرەکەم دابەزاندبوو؟

دەڵێت بەڵێ یارب، پێی دەفەرمووێت: چیت کرد بەوەی فێربوی؟

[١] - سنن الترمذی ٢٣٨٢

دەڵێت خوایە شەو و ڕۆژ ئیشم پێ دەکرد خوای گەورە پێی دەفەرمووێت: درۆت کرد فریشتەکانیش دەڵێن درۆت کرد بەڵکو دەتخوێند بۆ ئەوەی پێت بگوترێت خوێنەرە پێشت گوترا، ئەوجا دەوڵەمەندەکە دەهێندرێت و خوای گەورە پێی دەفەرمویێت: ئایا ڕزقتم فراوان نەکردبوو تاوەکو پێویستت بە کەس نەبێت؟ دەڵێت بەڵێ یارب، خوای گەورە پێی دەفەرمووێت: ئەدی چیت کرد بەوەی پێتم بەخشی بووی؟ دەڵێت خوایە پەیوەندی خزماتیم پێ دەگەیاند و دەمبەخشی خوای گەورە دەفەرموێت: درۆت کرد و فریشتەکانیش دەڵێن درۆت کرد بەڵکو لەبەر ئەوەت بوو پێت بگوترێت مەرد و بەخشندەیە پێشت گوترا، ئەوجا بانگی ئەو کەسە دەکرێت کە لە جیهاد کوژراوە خوای گەورە پێی دەفەرمووێت: بۆ کوژرای دەڵێت خوایە فەرمانم پێ کرا لە پێناوی تۆ بجەنگم منیش جەنگیم لە پێناوت تاوەکو کوژرام، خوای بێ هاوتا دەفەرموێت: درۆت کرد فریشتەکانیش دەڵێن درۆت کرد بەڵکو بۆ ئەوەت بوو پێت بگوترێت ئازایە پێشت گوترا.

بۆیە خۆشەویستمان دەفەرمووێت: ﴿أُولَئِكَ الثَّلَاثَةُ أَوَّلُ خَلْقِ اللَّهِ تُسَعَّرُ بِهِمُ النَّارُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾[1] واتە: ئەو سێ کەسە یەکەمین دروستکراوەکانی خوای گەورەنە کە ئاگری دۆزخیان پێ بە هێز دەکرێت.

داوامان لە اللَّه یە بە بەندەیەکی موەحیدی و موخلیس هەژمارمان بکات، ئامین

[1]- الترمذي ژمارەی فەرموودە: ٢٣٨٢

# فەرموودەی (٩)

## سەرەتای بانگەوازی

﴿لَمَّا بَعَثَ النَّبِيُّ ﴿ﷺ﴾ مُعَاذًا (رضي الله عنه) نَحْوَ الْيَمَن، قَالَ لَهُ(إِنَّكَ تَقْدَمُ عَلَى قَوْمٍ مِنْ أَهْلِ الْكِتَاب، فَلْيَكُنْ أَوَّلَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَى أَنْ يُوَحِّدُوا اللَّهَ تَعالَى، فَإِذَا عَرَفُوا ذَلِك، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمِهِمْ وَلَيْلَتِهِمْ، فَإِذَا صَلَّوْا، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ زَكَاةً فِي أَمْوَالِهِمْ، تُؤْخَذُ مِنْ غَنِيِّهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فَقِيرِهِمْ﴾[١]

واتە: لەو کاتەی خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ هاوەڵی بەرێز موعازی کوڕی جەبەل (ڕەزای خوای گەورەی لێ بێت) نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: ئەی موعاز تۆ دەڕۆی بۆ گەلێکی خاوەن کیتاب[٢] با یەکەم شت بانگەوازی بۆ بکەی یەکخوا پەرستی بێت ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵیان کردی پێیان ڕابگەیەنە کە خوای گەورە پێنج نوێژی لە سەریان فەرز کردوە لە شەو و ڕۆژێکدا ئەگەر گوێڕایەڵ بوون پێیان بڵێ: کە خوای گەورە فەرزی کردوە لەسەریان کە زەکاتی ماڵی دەوڵەمەندەکانیان دەربکرێت و بدرێت بە هەژارەکانیان.

---

[١] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٧٣٧٢

[٢] - خاوەن کیتاب: واتە جوولەکە وگاورن

**ڕوونکردنەوە:** لەم فەرموودەیە بۆمان دەردەکەوێت کە بناغە و بنچینەی ئیسلام تەوحیدە، چونکە یەکخوا پەرستی بانگەوازی هەموو پێغەمبەرانە(علیهم الصلاةو السلام) هەر وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾[1] واتە: بۆ هەموو گەلێک پێغەمبەرێکمان ناردوە بۆ ئەوەی پێیان ڕابگەیەنێت: تەنها اللّٰه بپەرستن و خۆیان دوور بکەنەوە لە تاغوتەکان. (٢)

گەورەترین شتێک فەرمانمان پێ کرابێت تەوحیدە و گەورەترین شتێکیش ڕێگریمان لێ کرابێت شیرک و هاوبەش دانانە بۆ خوای باڵا دەست، خوای گەورە نموونەیەکمان بۆ دەهێنێتەوە و دەفەرموێت: ﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن شُرَكَاءَ فِي مَا رَزَقْنَاكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَاءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾[3]

واتە: خوای گەورە هەر لە خودی خۆتان نموونەیەکی بۆ هێنانەتەوە، بۆ گونجاویی و نەگونجاویی شەریک بڕیار دان، بۆ ئەوەی چاک بزانن کە ئێوە چەندە هەڵەن لە بڕیاری هاوەڵ دانان بۆ خوای گەورە، نموونەکەش ئەوەیە، ئایا لەو ماڵ و سامانەی بە ئێوەمان داوە ڕازیی دەبن بەندەکانتان بکەنە

[1] - النحل/ ٣٦

[2] - (هەموو شتێک بپەسترێت جگە لە الله ئەویش پێ ڕازی بێت تاغوتە)

[3] - الروم ٢٨

هاوبەشی خۆتان، ئەوسا هەردولا وەکو یەک بن؟ هەر وەکو ئێوەی ئازاد بن لەماڵی خۆتان هاوبەشدابن بە بێ یەکتر دەستی بۆ نابەن و لە یەکتر بترسن ، ئاواش ترستان لەوان هەبێ و نەتوانن بێ ئەوان تەنها شتێکی لێ خەرج بکەن ؟ جا ئەگەر ئەوە بۆ خۆتان ڕازی نەبن، ئەی چۆن هاو بەشانێک بۆ خوای کەورە دادەنێن؟! ئابەو جۆرە بەڵگەو نیشانەکانی خۆمان ڕوون دەکەینەوە بۆ ئەو کەسانە  کە ژیری دەخەنە کارو تێدەگەن.

کەواتە، دەبێت لە پێش هەموو شتێک موەحید بین ئەوجا نوێژەکانمان بە جوانی و ڕێک و پێکی ئەنجامدەین و زەکاتی ماڵ و سامانەکانمان بەدڵ فراوانیەوە دەر بکەین و بیدەین بە هەژارەکانی موسوڵمانان بۆ ئەوەی هەژارەکان دڵ خۆشبن و بژێوی ژیانیان بەرنە سەر و حەسوودی و ئیرەیی بە دەوڵەمەندەکان نەبەن، چونکە پێویستی هەژارەکان بەقەد زەکاتەکانی دەوڵەمەندەکانیانە، بۆ ئەوەی هەمووومان بە خۆشی و بەختەوەری بژین، لە کۆتاییی داوام لەخوای گەورە و باڵا دەستە کە وشیارمان بکات و دوورمان بخاتەوە لە شیرک و هۆکارەکانی شیرکەوە و لە هەموو ئەو کارانەی ناڕێک و ناڕەوان، و تەوحید لە کردار و لە گوفتارەکانمان دەربکەوێت. امین

# فەرموودەی (١٠)

## جێگای باوەڕ

﴿قَالَ حُذَيْفَةُ (رضي الله عنه) حَدَّثَنَا رَسُولُ ﴿ﷺ﴾: أَنَّ الْأَمَانَةَ نَزَلَتْ فِي جَذْرِ قُلُوبِ الرِّجَالِ ثُمَّ عَلِمُوا مِنَ الْقُرْآنِ ثُمَّ عَلِمُوا مِنَ السُّنَّةِ﴾[١] واتە: لە هاوەڵی زۆر بەڕێزەوە حوزەیفەی کوڕی یەمان (ڕەزای خوای گەورەی لێ بێت) لە پێغەمبەری سەرووەرەوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی بەڕاستی باوەڕ دابەزیوە و جێگیربوە لە ناو دەمارەکانی دڵی پیاوانێک ئەوجا فێری قورئان بوون و فێری سوننەت بوون.

**ڕوونکردنەوە:** واتە بەڕاستی بیروباوەر بەخششێکی خوای گەورەیە دەبێت هەوڵبدەین بۆ ئەوەی ببینە کەسێکی وا شایەن بین کە ئیمان و باوەڕمان پێ ببەخشرێت و دەبێت خۆمان زۆر بڕازێنینەوە بە کار و کردەوەی چاک و پاک بۆ ئەوەی ببینە شایەنی بەخششی خوای گەورە چونکە خوای گەورە باوەڕ بە هەموو کەسێک نابەخشیت تەنها بەخۆشەویستانی خۆی دەبەخشێت هەر وەکو لە پێغەمبەری سەرووەرەوە ﴿ﷺ﴾ هاتوە و فەرموویەتی:

﴿إن الله يعطي الدنيا من يحب ومن لا يحب، ولا يعطي الإيمان إلا من أحب﴾[٢]

واتە: خوای باڵا دەست دونیا دەبەخشێت بەو کەسانەی خۆشی دەوێت و

---

[١] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٦٤٩٧

[٢] - الألباني السلسلة الصحيحة

ئەوانەی خۆشیشی ناوێن بەڵام باوەڕ تەنها بەو کەسانە دەبەخشێت کە خۆشی دەوێت.

چونکە باوەڕ زۆر بەنرخە و ناگونجێت شتی بە نرخ بدرێتە هەموو کەسێک، کەواتە، ئەگەر بووین بەخاوەن باوەڕ واتە، بووین بە خۆشەویستی خوای گەورە، ئەگەریش بووین بە خۆشەویستی خوای گەورە سەرکەوتوی دونیا و دوا ڕۆژ دەبین، هەر وەکو خوای گەورە باسی خۆشەویستانی خۆی دەکات لە فەرمودەیەکی قودسی و دەفەرمووێت: ﴿وَإِنْ سَأَلَنِي لَأُعْطِيَنَّهُ وَلَئِنِ اسْتَعَاذَنِي لَأُعِيذَنَّهُ﴾[1] واتە: ئەگەر داوام لێبکات پێی دەبەخشم و ئەگەر پەنام پێ بگرێت پەنای دەدەم.

دەبێت بیزانین یەکێک لە هۆکارەکانی بەدەست هێنانی خۆشەویستی خوای تعالی و بەهێزبونی باوەڕمان فێربونی قورئان و سوننەتە، و کارکردن بە واتا و مەبەستەکانیان، کەواتە، با زۆر لە خوای گەورە بپاڕێینەوە کە بیر وباوەڕێکی پاکمان پێ ببەخشێت و گومانیشمان وابێت کە پاڕانەوەکانمان وەردەگیرێت، بەڵام دەبێ گوێڕایەڵی گشت فەرمانەکانی بین هەروەکو لە قورئانی پیرۆز بە پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمووە: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾[2] واتە: ئەی

---

[1] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٦٥٠٢

[2] ـ البقرة ١٨٦

خۆشەویست ئەگەر پرسیاریان لێ کردی دەربارەی منەوە بەڕاستی من نێزیکم لێیانەوە، پاڕانەوە و دوعاکانی بەندانەکانم وەڵام دەدەمەوە ئەگەر تەنها لە من پاڕێنەوە، دەبا ئەوانیش بەرەو داواکانی منەوە بێن و فەرمانەکانی من جێبەجێ بکەن، بڕواشم پێ بهێنن بۆ ئەوەی سەرفەرازبن.

بابزانین جێگای باوەڕ و خۆپارێزی (تقوی) دڵە هەروەکو خۆشەویستمان (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿التَّقْوَى هَا هُنَا وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ﴾[1] واتە، تەقوا و جێگای لە خوا ترسان ئێرەیە سێ جاران ئاماژەی بۆ سینگی پیرۆزی ئەدا.

بەڵام سەلماندنی باوەڕ کار و کردەوەی چاکە، هەر وەکو لە پێشەوا حەسەنی بەسری ریوایەت کراوە کە فەرمویەتی:﴿لَيْسَ الإِيمَانَ بالتَّمَنِّي ولا بالتَّحَلِّي، وَلَكِنْ هُوَ مَا وَقَرَ في القَلْبِ، وَصَدَّقَهُ العَمَلُ، وَإِنَّ قَوْمَاً خَرَجُوا من الدُّنْيَا وَلَا عَمَلَ لَهُم، وَقَالُوا: نَحْنُ نُحْسِنُ الظَّنَّ باللهِ، وَكَذَبُوا، لَو أَحْسَنُوا الظَّنَّ لَأَحْسَنُوا العَمَلَ﴾[2] واتە: باوەڕ بە خۆزگە و خۆڕازاندنەوە نیە بەڵکو باوەڕ ئەوەیە لە دڵ جێگیر بووبێت و بە کردەوەش بیسەلمێنێت بەڕاستی خەلکانێك لە دونیا دەرچون و بە بێ ئەوەی هیچ کردەوەیەکیان ئەنجام دابێت و دەشیانگوت ئێمە گومانی باش بە خوای گەورە دەبەین بەڵام والله درۆیان کرد ئەگەر گومانی باشیان بە خوای باڵا دەست هەبوایا دەبا کردەوەی باشیان ئەنجام بدابا.

---

[1] - مسلم ژمارەی فەرموودە: ٢٥٦٤

[2] - رواه ابن النجار في (ذيل تاريخ بغداد) [تاريخ بغداد وذيوله: ٣٤/١٧]، والدَّيلمي في (مسند الفردوس) [٥٢٣٢]،

## فەرموودەی (١١)

## چاکترین کردەوە

**﴿عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُبْشِيٍّ الْخَثْعَمِيِّ (رضي الله عنه) أَنَّ النَّبِيَّ ﴿ﷺ﴾ سُئِلَ أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ﴿إِيمَانٌ لاَ شَكَّ فِيهِ وَجِهَادٌ لاَغُلُولَ فِيهِ وَحَجَّةٌ مَبْرُورَةٌ﴾**[١]

واتە: لە هاوەڵی بەڕێزەوە عبداللَّهی کوڕی حوبەیشەوە (ڕەزای خوای گەورە لێ بێت) پرسیاری لە خۆشەویست کرا ﴿ﷺ﴾ چ کردەوەیەک چاکترین کردەوەیە؟ فەرمووی: باوەڕێکی گومانی تێدا نەبێت و جەنگ و جیهادێک بێ ئەوەی هیچ شتێک لە دەست کەوتەکان ببات پێش دابەش کردنی و حەجێکی تەواو و بێ کەم و کوری و بێ تاوان.

**ڕونکردنەوە:** وشەی باوەڕی بێ گومان واتە، دیارە باوەڕی بە گومانیش هەیە پەنا بە خوای گەورە، چونکە ئەگەر لە قورئانی پیرۆز ورد ببینەوە دەبینین کە خوای گەورە سەنا و ستایشی ئەو باوەردارانە دەکات کە بیروباوەڕیان پتەو وجێگیرە، هەر وەکو فەرموویەتی: **﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا﴾**[٢] واتە: تەنها ئەوانە باوەڕداری تەواون کە باوەڕیان بە خوای باڵا دەست پاشان بە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هێناوە و گومان و دوو دڵیشیان نیە چونکە دوو دڵی لە باوەڕ،

---

[١] - النسائي ژمارەی فەرموودە: ٢٥٢٦/

[٢] - الحجرات/١٥

پێی ناگوترێت باوەڕی تەواو، چونکە ئەگەر دڵنیا نەبین لە گوتنی (لاإله إلاالله) باوەڕ تەواو نابێت چونکە یەکێک لە مەرجەکانی (لاإله إلاالله) یەقین و دڵنیا بوونە.

کەواتە دەبێت خۆمان دوور بخەینەوە لە هەموو شەک و گومانێک چونکە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز ڕێگریمان لێ دەکات گومانی خراپمان هەبێت هەر وەکو فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ﴾[1] واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتان زۆر بپارێزن لە گومانی خراپ، چونکە هەندێ لەو گومانانە گوناهو تاوانن.

خوای گەورە چەند شتێکمان لێ قەدەغە دەکات بەڵام یەکەمیان گومانە، ئەگەر گومان بردن بە یەکتری حەرام بێت، دەبێت گومان بردن بە دینی خوای زانا و دانا چ تاوانێک بێت؟ دەبێت بیزانین ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی بەهێزە کە کار و کردەوە بەشێکە لە باوەڕەوە چونکە فەرموودەکە باسی باشترین کردەوە دەکات ئەویش باوەڕێکی بێ گومانە، ئەوجا چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک پلەی لە جیهاد گەورەترە بەڵام مەبەست پێ جیهادی فەرزی کیفایەیە نەك جیهادی فەرزی عەین، چونکە جیهاد لە هەموو پلەکانی ئیسلام گەورەترە، وەکو

[1] - الحجرات١٢

پێغەمبەری مەزن(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ﴾[1] واتە: لوتکەی ئیسلام جیهادە.

بەڵام جیهادی فەرزی کیفاییە بەبێ ئیزنی دایک و باوک ناکرێت دەبێت بیزانین مافی دایک و باوک ئەوەندە گەورەیە لای خوای گەورە لەگەڵ مافی خۆی باسی کردوە لە زۆر شوێنی قورئاندا هەروەکو فەرموویەتی: ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾[2] واتە: پەروەردگارت بڕیاریداوە و وەسیەتی کردوە کە دەبێ هەر خۆی بپەرستن و دەبێت لەگەڵ دایک و باوکتاندا چاک بکەن.

ئەوجا دەفەرمووێت: (حج مبرور) واتە: حەجێکی پاک و بێگەرد و بێ کەمو کوڕی بە ماڵی حەڵاڵ چونکە دەبێتە مایەی سڕینەوەی هەموو تاوانەکانی ڕابوردوو. داواکارین لە خوای بێ هاوتا تەوفیقمان بدات بۆ هەموو چاکەیەک و دوورمان بخاتەوە لە هەموو خراپەیەک ئامین.

---

[1] - الترمذي ژمارەی فەرموودە: ٢٦١٦

[2] - ٢٣/الإسراء

# فەرموودەی (١٢)

# کردەوەکان بە کۆتایەکانە

﴿قَالَ: عَبْدُاللَّهِ بن مسعود (رضي الله عنه) حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ قَالَ: ( إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ مَلَكًا فَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ وَيُقَالُ لَهُ اكْتُبْ عَمَلَهُ وَرِزْقَهُ وَأَجَلَهُ وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ الرُّوحُ، فَإِنَّ الرَّجُلَ مِنْكُمْ لَيَعْمَلُ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجَنَّةِ إِلَّا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ كِتَابُهُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، وَيَعْمَلُ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّارِ إِلَّا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ﴾[١] واتە: لە عبداللّەی کوری مسعودەوە (ڕەزای خوای گەورەی لەسەر بێت) لە خۆشەویستی مەزنەوە ﴿ﷺ﴾ کە فەرموویەتی: بەڕاستی هەر یەکێک لە ئێوە دروستبوونی کۆدەبێتەوە لە ناو رەحمی دایکی لە ماوەی چل ڕۆژدا ئەوجا دوای چل ڕۆژیتر دەبێتە هەڵواسترِاو (علقة) چونکە خۆی بە رەحمی دایکیەوە هەڵواسیوە، ئەوجا دوای چل ڕۆژیتر دەبێتە جوتراوێک (مضغة) چونکە لەو قوناغە وەکو پارچە گۆشتێکی جوتراو وایە ئەوجا فریشتەیەکی بۆ ڕاوان دەکرێت، و فەرمانی پێ دەکرێت بە نووسینی

---

[١] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٣٢٠٨

چوار وشە و پێی دەگوترێت بنووسە کرداری و ڕزق و ڕۆزی و ئەجەلی و بەختەوەرە یاخود بەد بەخت، ئەوجا ڕوح فو دەکرێت لاشەی ئەوجا پیاوی وا هەیە کار و کردەوەی وا دەکات و ئەنجام دەدات تاوەکو لە نێوان خۆی و بەهەشت تەنها باڵێک دەمێنێت بەڵام ئەهلی دۆزەخە لە کۆتایی کردارێکی وا دەکات کە بە هۆیەوە شایەنی دۆزەخ بێت و دەمرێت و دەچتە دۆزەخەوە پەنا بە خوای گەورە؛ و پیاوی واش هەیە کاروکردەوەی دۆزەخی دەکات تاوەکو بەینی خۆی و دۆزەخ تەنها باڵێک دەمێنێت، بەڵام لە کۆتای تەمەنی کردارێکی وا دەکات کە ببێتە شایەنی بەهەشت و دەمرێت و دەچتە بەهەشتەوە.

**ڕوونکردنەوە:** بەڕاستی ئەم فەرموودەیە باسی سەرەتای دروست بوونی مرۆڤ و کۆتایەکەشیان بۆ دەکات کە چۆن دەبێت و ئەوەی لە ناوەندی سەرەتا و کۆتایدایە، بۆ ئەوەی زۆر خەریکی دونیا و کۆکردنەوەی ماڵ و شامان نەبین چونکە ماڵ و موڵکی دونیا ئەو کاتە بە نرخە کە ببێتە ڕێگایەک بۆ بەختەوەری دواڕۆژ، کەواتە بازۆر خەریکی ئەو شتە بین کە بۆی دروست کراوین ئەویش پەرستن و عیبادەتی خوای گەورەیە، هەر وەکو خوای موتەعال فەرموویەتی:

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾[1] واتە: من جنۆکە و مرۆڤەکانم دروست نەکردوە تەنها بۆ تەوحید و پەرستنی خۆم نەبێت.

---

[1] - الذاريات٥٦

کەواتە، دەبێت بزانین گرینگی عیبادەت و پەرستن بە کۆتاکەیەتی، کەواتە، بازۆر ئاگاداری کۆتا کردەوەمان بین و بابۆخۆمان هەڵبژێرین لەسەر چ کردەوەیەك پێمان خۆشە بمرین؟ چونکە، هەموو کردارەکانمان بە کۆتاکەیەتی بۆ نموونە ئەگەر کەسێک بە ڕۆژو بێت تاوەکۆ چەند خولەکێک پێش خۆر ئاوابوون بەڵام بە ئەنقەست بچێت پەرداخێک ئاو بخواتەوە بێگومان هیچ پاداشتی بۆ نانووسرێت چونکە ڕۆژوەکەی دەشکێت، کەواتە، هەموو کاروکردەوەکانمان بە کۆتایەکەیەتی هەر وەکو خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالْخَوَاتِيمِ﴾[1] واتە: هەموو کار و کردارەکان بە کۆتاکەیەتی.

بەڕێزەکانم ڕۆژێکناملیکەیەکم خوێندەوە بەسەرهاتێکی تێدا بوو بەڕاستی جێگای پەندو عیبرەت بوو دەڵێت یەکێک لە زانایانی پێشینانمان چۆلەکەیەکی هەبوو فێری کردبوو بە بەردەوام دەیگوت (لاإلە إلاالله) شەوێک پشیلەیێک پڕیدا چۆلەکەکە بەڵام خاوەنەکەی بەهانای هات و ڕزگاری کرد، بەڵام چۆلەکەکە بریندار بوو دوایش مرد زاناکە زۆر غەمبار و خەمناک بوو و زۆریش دەگریا، قوتابیەکانی پێیان گوت مامۆستا بۆ دەگریێ گۆتی: واللّٰه دەترسم منیش وەکو ئەم چۆلەکەیەم لێ بەسەر بێت چونکە فێرم کردبوو کە لە تەنگانە و لە خۆشی دەیگۆت (لاإله إلاالله) بەڵام لە کاتی پشیلەکە پڕیدابویێ؟

[1] - البخاری ژمارەی فەرموودە: ٦٦٠٧

وشەی (لاإله إلاالله) کەی لە بیر کردبوو منیش دەترسێم لە سەرەمەرگدا پێم نەگوترێت (لاإله إلاالله) پەنا بەخوای گەورە، چونکە بەڕاستی بەندە لەسەر چ شتێک بژیت هەر لەسەر ئەو شتەش دەمرێت و لەسەر چ شتێکیش بمرێت هەر لەسەر ئەو شتە زیندوو دەکرێتەوە، پێغەمبەری پێشەوامان ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت:

﴿يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيْهِ﴾[1] واتە: بەندەکان لەسەر چ شتێک بمرن هەر لەسەر ئەو شتەش زیندو دەبنەوە.

بۆیە براکانم زۆر پێویستە ئێمەی ناومان لە خۆناوە باوەڕدار لەسەر عیبادەت و پەرستشی خوای مێهربان بەردەوام بین بۆ ئەوەی لەسەر کردەوەیەك بمرین خوای گەورە لێ ڕازی بێت، هەر وەکو گوتراوە گۆزە لە ڕێگای ئاو دەشکێت کەواتە، بەردەوام بوون لەسەر خوا پەرستی دەبێتە هۆی بەدەست هێنانی عاقیبەت خێری هەر ئەویش مەبەستە لە بەنداتی ڕاستەقینە.

داوامان لە خالقی گەورەیە بەردەوام ئامادەبین لە هەموو کات و شوێنێکدا بۆ ئەوەی لە هەر کاتێک (ملك الموت) ڕێی لێ کرتین بۆ تەسلیم کردنی ئەمانەتە کەمان و بەڕوویەکی سپی بچینەوەی خزمەتی خوای گەورەئامین.

[1] - مسلم ژمارەی فەرموودە: ٢٨٧٨

# فەرموودەی (١٣)

# فراوانی بەزەیی خوای گەورە

﴿عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ يَقُولُ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ (مَنْ لَقِيَنِي بِقُرَابِ الْأَرْضِ خَطِيئَةً لَا يُشْرِكُ بِي شَيْئًا لَقِيتُهُ بِمِثْلِهَا مَغْفِرَةً﴾[1] واتە: لە هاوەڵی بەڕێز ئەبی زەڕی غەفاری (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری مەزنەوە ﴿ﷺ﴾ کە فەرموویەتی: خوای گەورە دەفەرموێت: هەر بەندەیەک بگەڕێتەوە لای من ئەگەر پڕی زەوی تاوانی هەبێت تەنها شیرک و هاوبەشی بۆ من بڕیارِ نەدابێت بە ئەندازەی تاوانەکانی لێخوشبونی خۆمی پێ دەبەخشم.

**ڕوونکردنەوە:** بەرێزان ئەم فەرموودەیە لە فەرموودەکانی ئومێد و رەجابونە بە ڕەحمەتی خوای گەورە، واتە، مرۆڤ چەندە تاوانی هەبێت بەڵام هاوبەشی بڕیار نەدابێت ئەگەر تەوبە بکات و پەشیمان بوبێتەوە لە تاوانەکانی ئومێد وایە خوای گەورە لێی خۆش بێت و بیباتە بەهەشت بە فەزڵی خۆی، بەڵام مرۆڤی تاوانبار با هەردەم لە هەرەشەکان خوای گەورە پاشان پێغەمبەرەکەی بترسێت بۆ ئەوەی پاشگەز ببێتەوە لە تاوان و سەرپێچی خوای باڵادەست چونکە پێغەمبەر ئادەم

[1]- مسلم ژمارەی فەرموودە: ٢٦٨٧

(علیه‌السلام) لەسەر یەک سەرپێچی لە بەهەشت دەرکرا؛ واتە، با بێ ئومێد نەبین لە بەزەیی خوای مێهرەبان و دڵنیاش نەبین لە خەشم و تورەیی خوای گەورە، بەڵام ئەگەر خۆمان لە شیرک و هاوبەش دانان دوور خستەوە لە ڕەحمەتی خوای گەورە بە دوور نابین، چونکە خوای گەورە تەنها لە شیرک و هاوبەشدانان خۆش نابێت چونکە شیرک و هاوەڵدانان بوختانێکی گەورەیە، هەر وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَ يَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا﴾[1] واتە: بەڕاستی خوایی گەورە خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت جا ئەوەی هاوەڵ و شەریک بۆ خوای موتەعال بڕیار بدات، ئەوە ئیتر بەڕاستی تاوانێکی گەورەی هەڵبەستووە.

بەڵام با هەرگیز تەماشای تاوان نەکەین بە بچووکی چونکە تاوان هەر چەند بچووک بێت سەرپێچی زاتێکی گەورەیە با لە بیریشمان نەچێت تاوان ڕێگای دۆزەخ و خەشمی خوایە واتە، تەنها ڕێگای ڕزگاربونمان لە دۆزەخ و عەزابی خوای گەورە تەوحید و یەکخواپەرستیە، کەواتە، جێگای خۆیەتی بەشێک لە تەمەنی خۆمان تەرخان بکەین بۆ شارەزابونمان لە تەوحید و خۆ پاراستن لە شیرک و جۆرەکانی شیرک چونکە بەڕاستی شیرک لێخۆشبوونی نیە بۆ هیچ

---

[1] - النساء ٤٨

کەسێک ئەگەر ئەو کەسە پێغەمبەریش بێت هەروەکو خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾[١] واتە: ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بەڕاستی وەحی و نیگامان بۆ تو و بۆ ئەوانەی پێش توش کردووە ئەگەر شیرک ئەنجام بدەی بەڕاستی هەموو کردەوەکانت پوچەڵ دەبێت و لە زەرەرمەندان دەبی.

باشە ئەگەر شیرک هۆکاری پوچەلکردنی چاکەکانی پێغەمبەر بێت ﴿ﷺ﴾ ؟ چ جای ئەوانەی خاوەن چەندها گوناهو تاوان بێت پەنا بەخوای گەورە.

داواکارین لە خوای باڵا دەست بەرچاو ڕوونمان بکات لە شیرک و لە هەر تاوانێک ببێتە مایەیی شەرمەزاریمان لە دونیا و دوارۆژ، ئامین

[١] - الزمر/٦٥

# فەرمووودەی (١٤)

# نیشانەکەنی باوەڕ

﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يُؤْذِ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ﴾[١] واتە: لە هاوەڵی زۆر بەڕێزە ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خۆشەویستەوە ﴿ﷺ﴾ کە دەفەرموویت: هەر کەسێک باوەڕی بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەبێت با ئازاری دراوسێیەکەی نەدات و هەر کەسێک باوەڕی بەخوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێت با ڕێز لە میوانەکانی بگرێت و هەر کەسێک باوەڕی بەخوا و بەڕۆژی دوای هەبێت با قسەی خێر وچاک بکات یان با بێ دەنگ بێت.

**ڕوونکردنەوە:** بزانە ڕەحمەتی خوات لێبێت ئەم فەرموودەیە مەبەست لە باوەڕ واتە، باوەڕی تەواو، کەواتە، هەر کەسێک بیەوێت ببێتە خاوەن باوەڕێکی تەواو با ڕێز لە دراوسێیەکانی بگرێت و دوور کەوێتەوە لە ئەزیەت و ئازاردانیان، هەروەها یەکێک لە گەورەیی موسوڵمان ڕێزگرتنە لە میوانەکانی بزانە خوای گەورە چۆن باسی پێغەمبەر ئیبراهیم دەکات (علیه السلام)

---

[١] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٦٠١٨

﴿وَلَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَىٰ﴾ کە فریشتەکان مژدەی ئیسحاق و یاعقوب (عليهما السلام) دەدەنە ئیبراهیم ﴿قَالُوا سَلَامًا قَالَ سَلَامٌ﴾ گوتیان سڵاو بۆ ئیبراهیم ئەویش گوتی ئێوەیش بەهەمیشە سڵاوتان لێبێ ﴿فَمَا لَبِثَ أَن جَاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ﴾[1] دوای بەخێر هاتنیان زوو چوو گۆشتی گۆلکێکی برژاوی بۆ هێنان و لەبەر دەمیان داینا و فەرمووی لێکردن.

لەم ئایەتە خوای گەورە باسی سەخاوەتی پێغەمبەر ئیبراهیم دەکات (عليه السلام) بۆ میوانەکانی کەواتە، ئەمە سیفەتێکی جوانە ئێوەی بڕواداریش ئاوابن، هەروەها دەبێت ئاگاداری قسەکانمان بین چونکە وەکو گوتراوە زوبان بەڵای سەرە، خۆشەویستانم خوای گەورە زوبانی بۆمان لە دوای دوو دەرگا داناوە دەرگای ددانەکان و دەرگای لێوەکان بۆ ئەوەی زۆر ئاگاداری بین.

چونکە پاراستنی زوبان پاراستنی هەموو لاشەیە هەر وەکو پێغەمبەری خۆشەویست ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: هەر کاتێک مرۆڤ ڕوژ دەکاتەوە هەموو ئەندامەکانی لاشەی بە زوبان دەڵێن لە خوای موتەعالی بترسە چونکە، ﴿إِنِ اسْتَقَمْتَ اسْتَقَمْنَا وَإِنِ اعْوَجَجْتَ اعْوَجَجْنَا﴾[2] واتە: ئەگەر تو ڕاست و باش بووی ئێمەش باش دەبین، بەڵام ئەگەر خراب بووی ئێمەش خراب دەبین.

---

[1] - هود ٦٩

[2] - الترمذي ژمارەی فەرموودە: ٢٤٠٧

واتە: هەموو ئەندامەکان بە زوبانەوە بەستراوەتەوە، دەبێت بشزانین فەرموودەکە هەڕەشەی تێدایە بەڵام بۆ کەسانێک لێی ورد ببنەوە چونکە دەفەرمووێت: ئازاری دراوسێتان نەدەن و ڕێز لە میوانەکانتان بگرن و قسەی خێر و چاک بکەن ئەگەر باوەڕتان هەبێت، واتە، ئەمە سیفەتی باوەڕدارانە هەر کەسێک ئاوا نەبێت دەبێت بەخۆیدا بچێتەوە و لە باوەڕەکەی خۆی بترسێت، هەروەها ئەم فەرموودەیە فێرمان دەکات کە مرۆڤی باوەڕدار هیچ شتێک ناکات تەنها چاکە نەبێت چونکە دەزانێت هەر شتێک ئەنجام بدات لە ڕۆژی دوایی دەیبینێتەوە هەر وەکو خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾[1] واتە: هەر کەسێک کەمترین چاکە بکات دەیبینێتەوە و هەر کەسێکیش بچوکترین خراپە بکات دەبینێتەوە.

خوای باڵا دەست باسی گوفتاری مرۆڤەکانمان دەکات و دەفەرمووێت:

﴿مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾[2] واتە: مرۆڤ هەر قسەیەک دەربڕێت لەسەری دەنووسرێت.

کەواتە؛ بڕواداری ژیر دەبێت ئاگاداری هەڵسوکەوت و زوبانی بێت بۆ ئەوەی لە ڕۆژی پاداشت و سزا پەشیمان نەبێتەوە چونکە لەو ڕۆژە هەر کەسێک تەماشای بەروبومی کردەوەکانی دەکات هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێت:

---

[1] - الزلزلة ٧-٨

[2] - ق ١٨

﴿إِنَّا أَنذَرْنَاكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ الْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ﴾[1] واتە: بەڕاستی ئێمە ئێوەمان ئاگادار کردەوە لە سزایەکی نێزیک لەو ڕۆژەی هەر کەسێک چاوەڕوانی کردەوەکانیەتی.

بۆیە با هەوڵ بدەین ئەگەر چاک نەبین باخرابیش نەبین داوامان لە خاوەنی گەردونە هەموو کارەکانمان چاک و پاك بکات وجێگای ڕەزامەندی خۆیبێت ئامین.

[1] - النبأ٤٠

# فەرموودەی (١٥)

## خۆشەویستی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

﴿عَنْ أَنَسٍ: (رضي الله عنه) قَالَ النَّبِيُّ: ﴿ﷺ﴾ لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾[١] واتە: لە هاوەلی بەڕێزەوە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای تعالی لیّ بێت) لە پێغەمبەری خۆشەویستەوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: هیچ کەسێک باوەڕی نیە تاوەکۆ منی خۆشتر نەوێت لە باوکی و لە منداڵەکانی و لە تێکڕای خەلکی.

خۆشەویستانم مرۆڤ دوو(٢) جۆرە خۆشەویستی تێداییە.

یەکەم: خۆشەویستی جیبلی واتە مرۆڤ لەگەڵ دروست بۆنی خۆشەویستی ماڵ و منداڵی لەگەڵ دروست بوە، بەڵام ئەو خۆشەویستەی مەبەست نیە لەم فەرموودە شیرینە،

دووەم: خۆشەویستی هەڵبژاردن واتە، بەدەستی خۆمان هەڵیدەبژێرین.

خەتابی دەفەرمووێت خۆشەویستی سیّ (٣)جۆرە

یەکەم: خۆشەویستی ڕێز و ئیحترام وەکو خۆشویستنی دایک وباوک.

دووەم: خۆشەویستی رەحم و بەزەیی وەکو خۆشویستنی منداڵ.

---

[١] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ١٥

سێیەم: خۆشەویستی تێکەڵاو وەکو خۆشویستنی خەڵک

لەم فەرموودەیە پێغەمبەری خۆشەویست ﴿ﷺ﴾ هەرسێ جۆرە خۆشەویستی کۆکردۆتەوە، چونکە پێغەمبەری سەروەر لە دایک وباوک و منداڵ و هەموو خەڵک و لە خودی خۆشمان لە پێشترە بۆمان هەروەکو خوای باڵادەست دەفەرمووێت: ﴿النَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ﴾[1] واتە: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نزیکترە لە ئیمانداران لەخودی خۆیان.

هەر بەهۆی پێغەمبەرەوە بوو ڕێنوێنی کراین و هەر ئەویش هۆکار بوو بۆ ڕزگاربونمان لە گومڕایی و سەر گەردانی بۆ ڕووناکی ئیسلام هەر وەکو خوای بێ هاوتا فەرموویەتی: ﴿كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾[2] واتە: ئەم قورئانە کتێبێکە ناردومانە خوارەوە بۆتۆ تاخەڵکی بە فەرمانی پەروەردگاریان لە تاریکاییەکانی کوفر و نەزانی و نەفامی بێنێتە دەرەوە بۆ ڕووناکی ئیمان و زانست.

کەواتە، دەبێت پێغەمبەرمان ﴿ﷺ﴾ بەدڵ و بەگیان خۆش بوێت چونکە خۆش ویستنی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە باوەڕەوەیە بەڵکو ئەو پەڕی پلە بەرزەکەی باوەڕە، ئەوجا نیشانەکانی خۆشەویستی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە گوێڕایەڵی کردن و سەرپێچی نەکردنی دەبێت.

---

[1] - الاحزاب ٦
[2] - إبراهيم/١

بابیزانین لوتکەی خۆشەویستی چاولێکردن و لەئاسا کردنەوەیەتی، لە هەموو کەسیش زیاتر پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾ خۆشەویستبێت هاوەڵانن؛ وەکو شاعیر دەفەرمووێت: لە وەسفی هاوەڵان (بە نوری ئەو هەنندە مونعەکیس ببوون بێگانەی تازە هاتوو وای دەزانی پێغەمبەرستانە) واتە: نیشانەی خۆشەویستی خۆ پێ چواندن و لاسا کردنەوەیە، هەروەکو خوای گەورە دەیکاتە مەرج بۆ سەلماندنی خۆشەویستی، و دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[1] واتە: ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێیان ڕابگەینە ئەگەر خوی گەورەتان خۆش دەوێت ئەوە شوێنکەوتەی من بن خوای موتەعال خۆشی دەوێن و لە تاوانەکانیشتان خۆش دەبێت چونکە خوای گەورە لێ خۆش بو و بەبەزەییە.

بەڕاستی هەرچی خێر و خۆشیە لە خواوەیە و ئەوجا لە شوێنکەوتنی پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ لە بیریشمان نەچێت پێغەمبەری مەزن ﴿ﷺ﴾ زۆری هەوڵی دا تاوەکو ئێمە بژین لەسەر بەرنامەی خوای بالادەست و بشمرین لەسەر تەوحیدی خوای تاکو تەنیا بۆ ئەوەی لە دواڕۆژ بگەینە ڕەزامەندی و میهربانی خوای گەورە، بزانە خۆشەویستمان ئەوەندە خۆی ماندوو دەکرد تاوەکو خوای باڵادەست پێ فەرموو: ﴿فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَى آثَارِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا بِهَذَا الْحَدِيثِ أَسَفًا﴾[2]

---

[1]- آل عمران٣١

[2] - الكهف ٦

واتە ئەی خۆشەویست ئەوەندە هەوڵ دەدەی بۆ ئەوەی باوەڕ بهێنن خەریکە خۆت لەناوببەی.

ئەمە لە دونیا لە دواڕۆژیش ﴿لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾[1] واتە: لەو ڕۆژەدا هەر کەسێك لەوانە ئەوەندە سەرگەرمی کێشەی خۆیەتی و ناتوانێت فریای کەسی تر بکەوێت.

تەنها کەسێکە خۆی لەبیر کردوە و خەریکی شوێنکەوتوەکانیەتی ئەویش خۆشەویستمانە ﷺ دەفەرمووێت: ﴿يَا رَبِّ، أُمَّتِي أُمَّتِي﴾[2] واتە: ئەی پەروەردگارم ئوممەتەکەم، ئوممەتەکەم.

تەنها هەموو خەمی ئوممەتەکەیەتی بەڕاستی جێگای خۆیەتی پێغەمبەری خوامان ﷺ لە هەموو ژین و ژیانمان خۆشتر بوێت، چونکە لە خودی خۆمان بەخەم ترە و چاکەشی زیاترە بۆمان، دوامان لە بەدیهێنەری گشت بونەوەرە کە عاقیبەت خێرمان بکات بەمنەت ورەحمەتی خۆی ئامین.

[1] - عبس ٣٧
[2] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٧٥١٠

# فەرموودەی (١٦)

# گەورەیی وشەی تەوحید

﴿عن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رضي الله عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ إِنَّ اللَّهَ سَيُخَلِّصُ رَجُلًا مِنْ أُمَّتِي عَلَى رُؤوسِ الْخَلَائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَنْشُرُ عَلَيْهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ سِجِلًّا كُلُّ سِجِلٍّ مِثْلُ مَدِّ الْبَصَرِ ثُمَّ يَقُولُ أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا أَظَلَمَكَ كَتَبَتِي الْحَافِظُونَ فَيَقُولُ لَا يَا رَبِّ فَيَقُولُ أَفَلَكَ عُذْرٌ فَيَقُولُ لَا يَا رَبِّ فَيَقُولُ بَلَى إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَةً فَإِنَّهُ لَا ظُلْمَ عَلَيْكَ الْيَوْمَ فَتَخْرُجُ بِطَاقَةٌ فِيهَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ فَيَقُولُ احْضُرْ وَزْنَكَ فَيَقُولُ يَارَبِّ مَا هَذِهِ الْبِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلَّاتِ فَقَالَ إِنَّكَ لَا تُظْلَمُ قَالَ فَتُوضَعُ السِّجِلَّاتُ فِي كَفَّةٍ وَالْبِطَاقَةُ فِي كَفَّةٍ فَطَاشَتْ السِّجِلَّاتُ وَثَقُلَتْ الْبِطَاقَةُ فَلَا يَثْقُلُ مَعَ اسْمِ اللَّهِ شَيْءٌ﴾[1] واتە: لە هاوەڵی ئازیز عبداللّەی کوڕی عەمری کوڕی عاس (ڕەزای خوای مێهربان لە خۆی و باوکی بێت) لە پێغەمبەری مەزنەوە ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: خوای تعالی لە ڕۆژی دوایی پیاوێک لە ئوممەتی من ڕادەگرێت لە بەرچاوی هەموو دروستکراوەکان تاوانەکانی پڕی نەوەت و نۆ کیتابە هەر کیتابێک بە ئەندازەی بینینی چاوە پاشان خوای گەورە پێی دەفەرمووێت: ئایا فریشتەکانم

[1] - (أحمد: [٦٦٩٩] والترمذي: [٢٦٣٩] وصححه الشيخ الألباني.

ستەمیان لێت کرد، یاخود زیادیان لەسەرت نووسیوە؟ دەڵێت: نەخێر، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ئایا هیچ چاکەیەکێت هەیە؟ دەڵێت نەخێر، پێی دەفەرموێت: بەڵکو چاکەیەکت لامان هەیە، کارتێکی بچووکی بۆ دەهێنن کارتەکە دەکەنەوە لە ناوی نووسراوە: ﴿أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ﴾ پێی دەگوترێت: وەرە ئامادەبە لە کێشانی کردەوەکانت، ئەویش دەڵێت: یاربی ئەو کارتە بچووکە چ سوودێکی هەیە لە بەرامبەر ئەو نەوەت و نۆ کیتابە؟ خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ستەمت لێ ناکرێت ئەمڕۆ، ئەوجا کتێبی تاوانەکانی دەخرێنە لایەکی تەرازووەکە و کارتەکەش دەخرێتە لایەکەیتری تەرازووەکە کتێبەکان هەمووی بەرز دەکات و کارتەکەش قورس دەبێت چونکە هیچ شتێک لە بەرامبەر ناوی اللَّه قورس نابێت.

**ڕوونکردنەوە:** واتە، ڕەحم و بەزەیی خوای گەورە گەلەك زۆرە، کەسێک لێی بێ ئومێد دەبێت کە بێ بەشە لە ڕەحمەتی خوای گەورە، بەڵام لە بیریشمان بێت عەزابی خوای بێ هاوتا ژیانی لە خوا ترسان تاڵ کردبوو، وەکو هاتووە: ﴿قَالَ أَبُو بَكْرٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ شِبْتَ؟ قَالَ شَيَّبَتْنِي هُودٌ وَالْوَاقِعَةُ وَالْمُرْسَلَاتُ وَ﴿عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ﴾ وَ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾[1] واتە: ئەبو بەکری ڕاستگۆی ئوممەت فەرمووی: ئەی خۆشەویست خەریکە پیر دەبی، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی:

---

[1] - سنن الترمذی ٣٢٩٧

سورەتی (هود و الواقعه و المرسلات و عم يتساءلون و إذا الشمس كورت)، منیان پیرکرد.

چونکە ئەم سورەتانە باسی قورسی و ناخۆشیەکانی قیامەت دەکەن، کەواتە، دەبێت زۆر بترسین لە عەزابی خوای گەورە و ئومێدی زۆریشمان هەبێت بە بەزەیی خوای سبحان و تعالی چونکە ئێمە نە دەزانین سنوری بە زەیی خوای عزوجل چەندە نە سنوری عەزابی خوای گەورە، هەر وەکو پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمویەتی: ﴿إِنَّ لِلَّهِ مِائَةَ رَحْمَةٍ، أَنْزَلَ مِنْهَا رَحْمَةً وَاحِدَةً بَيْنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ، وَالْبَهَائِمِ وَالْهَوَامِّ، فَبِهَا يَتَعَاطَفُونَ، وَبِهَا يَتَرَاحَمُونَ، وَبِهَا تَعْطِفُ الْوَحْشُ عَلَى وَلَدِهَا، وَأَخَّرَ اللَّهُ تِسْعًا وَتِسْعِينَ رَحْمَةً، يَرْحَمُ بِهَا عِبَادَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾[١] واتە: خوای بێ هاوتا سەت ڕەحمی هەیە، تەنها یەك ڕەحمی لەوان دابەزاندوە بۆ ناو جنۆکە و مرۆڤ و ئاژەڵ و ژەهردارەکان (مار، دووپشک) بەو یەك ڕەحمە بەزەیی بە یەکتر دەبەن و نەوەت و نۆ ڕەحمەکەی تری هەڵگرتوە بۆ ئەوەی لە دوارۆژ بەزەیی بێتەوە بە دروستکراوەکانی.

کەواتە، ڕەحمەتت لێبێت با گومانمان نەبێت هەر کەسێک ئەگەر چەندەها تاوان و گوناهیشی کردبێت تەنها تەوحیدێکی تەواوی بە دڵسۆزی هەبێت بە ویستی خوای باڵادەست ڕزگاری دەبێت، بەڵام با بەهەڵە تێنەگەین و لە تاوان کردن بێخەم بین، چونکە بەڕاستی وەکو هاوەڵی جوامێر عبداللەی کوڕی مەسعود

---

[١] - مسلم ژمارەی فەرموودە: ٢٧٥٢

دەفەرموویت: ﴿إِنَّ الْمُؤْمِنَ يَرَى ذُنُوبَهُ كَأَنَّهُ قَاعِدٌ تَحْتَ جَبَلٍ، يَخَافُ أَنْ يَقَعَ عَلَيْهِ، وَإِنَّ الْفَاجِرَ يَرَى ذُنُوبَهُ كَذُبَابٍ مَرَّ عَلَى أَنْفِهِ فَقَالَ بِهِ هَكَذَا﴾[١] واتە: باوەڕدار وا هەست بە تاوان دەکات هەر وەکو چیا و شاخێکی گەورە بەسەریدا بڕوخێت بەڵام کەسی خراپ و بێ دین تاوانەکانی دەبینێت هەر وەکو مێشێک لەسەر کەپووی دابنیشێت ئەویش بەدەست ئاوای لێبکات.

چونکە، نابێت تەماشای بچوکی تاوان بکەین بەڵکو با تەماشای گەورەیی ئەو زاتە بکەین کە سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەین، واتە، تاوان بارمان قورس دەکات و تەنها ئەو کەسە ڕزگاری دەبێت کە باری سوک بێت لە تاوان چونکە ڕێگای قیامەت زۆر ئاسان نیە، کەواتە، تاوانەکانی بەندە لێپێچینەوەی زۆری لەسەرە ئەگەر بەهەشتیش بین تاوان ماوەیەک دوامان دەخات بۆ چوونە بەهەشت.

پەنا بە خوای تعالی لە هەموو کردار و گوفتارێک بەهۆیەوە خوای گەورە لێمان بڕەنجێت، بەڕاستی جێگای داخە ئاوا کەمتەر خەم و بێ ئاگا بین لە سەر ئەنجامی دواڕۆژی خۆمان. داوامان لە خالقی گەورەیە لە تاوانەکانمان خۆش بێت و بەبەهەشتی خۆیمان شاد بکات ئامین.

---

[١] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٦٣٠٨

# فەرموودەی (١٧)

## مردن لەسەر تەوحید

﴿أَنَّ أَبَا ذَرٍّ (رضي الله عنه) قَالَ : أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﴿ﷺ﴾ وَعَلَيْهِ ثَوْبٌ أَبْيَضُ وَهُوَ نَائِمٌ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ وَقَدِ اسْتَيْقَظَ، فَقَالَ مَامِنْعَبْدٍ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ثُمَّ مَاتَ عَلَى ذَلِكَ إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ، قُلْتُ وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ ؟ قَالَ وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ قُلْتُ وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ ؟ قَالَ وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ قُلْتُ وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ ؟ قَالَ وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ عَلَى رَغْمِ أَنْفِ أَبِي ذَرٍّ وَكَانَ أَبُو ذَرٍّ إِذَا حَدَّثَ بِهَذَا قَالَ وَإِنْ رَغِمَ أَنْفُ أَبِي ذَرٍّ﴾[١] واتە: ئەبو زەری غەفاری (ڕەزای خوای تعالى لىٚ بێت) فەرموویەتی: ڕۆیشتمە خزمەتی پێغەمبەری مەزنەوە ﴿ﷺ﴾ خەوتبوو بەجلێکی سپیەوە ئەوجا پاش کەمێکی تر چومەوە خزمەتی بەئاگا هاتبوو ئینجا فەرمووی: هەر بەندەیەک بڵێت: لاإله إلااللَّه ئەوجا لەسەری بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە، ئەبو زەر فەرمووی: ئەگەر زینا و دزیشی کردبێت؟ پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: بەڵێ ئەگەر زینا و دزیشی کردبێت، و ئەبو زەر گوتی: ئەگەر زینا و دزیشی کردبێت؟ پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: بەڵێ ئەگەر زینا و دزیشی کردبێت، و ئەبو زەر گوتی: ئەگەر زینا و ئەگەر زینا و دزیشی کردبێت؟ پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾

---

[١] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٥٨٢٧

فەرمووی: بەڵێ ئەگەر زینا و دزیشی کردبێت، لەسەر کەپوی ئەبو زەر، واتە، لەڕقی ئەبو زەر.

کەواتە، برای خۆشەویست بەڕاستی ئەو نیعمەتەی لەگەڵ ئێمەی ئوممەتی محمد ﴿ﷺ﴾ کراوە لەگەڵ هیچ گەلێک و ئوممەتێک نەکراوە چونکە هەر چەند گوناهو تاوان باربین تەنها تەوبەیەکی ڕاست و دروست بکەین، خوای گەورە نەک تەنها تاوانەکانمان دەسڕێتەوە بەڵکو هەموو تاوانەکانمان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە بەڵام دەبێت مەرجەکانی تەوبە لە خۆماندا بێنینە دی، هەر وەکو خوای باڵادەست دەفەرمووێت: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَـٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّـهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ﴾[1] واتە: مەگەر کەسێک پەشیمان دەبێتەوە و بڕوا بێنێ و کاری چاکە ئەنجام بدا ئا ئەو کەسانە خوای گەورە گوناهو خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە.

ئەم نیعمەت و بەخششە تەنها بە ئێمەی ئوممەتی محمد ﴿ﷺ﴾دراوە، کەواتە دەبێت ئێمەش لە هەموو ئوممەتێک سوپاسگوزار تربین، وەکو پێشەواکەمان بین، دایکی باوەڕداران عائیشە دەفەرمووێت:

[1] - الفرقان٧٠

﴿أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ كَانَ يَقُومُ مِنَ اللَّيْلِ حَتَّى تَتَفَطَّرَ قَدَمَاهُ فَقَالَتْ عَائِشَةُ لِمَ تَصْنَعُ هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟وَقَدْ غَفَرَاللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ قَالَ أَفَلَا أُحِبُّ أَنْ أَكُونَ عَبْدًا شَكُورًا﴾[1] واتە: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لە شەو نوێژ ئەوەندە دەمایەوە تاوەکو پێیە پیرۆزەکانی ئەستور دەبون عائیشە دەفەرموێت: منیش پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بۆ وا دەکەی خۆ خوای گەورە لە هەموو تاوانەکانی دەهاتو و ڕابردووت خۆش بووە، ئەویش فەرمووی: ئەی نابێت بەندەیەکی سوپاس گوزار بم؟.

چونکە ئەگەر بمانەوێت نیعمەتەکانی خوای گەورە لەسەرماندا زیاد و بەردەوام بێت دەبێت سوپاس لە سەر نیعمەتەکانی بکەین بۆ ئەوەی زیاد بێت، هەر وەکو خوای گەورە وەعدی پێ داوین و دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾[2] واتە: لە یادتان بێت کە: پەروەردگارتان بڕیاری داوە، سوێند بەخوای گەردوون ئەگەر سوپاسگوزار و شوکرانە بژێر بن، ڕزق و ڕۆزی و ناز و نیعمەتتان بەسەردا دەڕێژێنم و زیادی دەکەم.

بۆیە بیزانن ڕەحمەتتان لێبێت خوای گەورە بەڵێنی پێ داوین ئەگەر شوکرانەی بکەین نیعمەتەکانی بەسەرمان زیاد دەکات، کەواتە، خۆشەویستان چۆن موسوڵمان بوین و وشەی (لاإلە إلااللّٰه) مان دەربڕی با کار و کردەوەش بە واتاو

[1] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٤٨٣٧
[2] - إبراهيم ٧

مەبەستەکانی بکەین و لەسەریشی بەردەوام بین بۆ ئەوەی لەسەرە مەرگیش لەسەر زوبانمان بێت و بتوانین بە جوانی دەری ببڕین بۆ ئەوەی ڕەزامەندی خالقی گەورە بەدەست بێنین، هەر وەکو پێغەمبەری مەزن ﴿ﷺ﴾ بەو هاوەڵەی فەرموو: کە داوای لێ کرد شتێکی فێر بکات دەستی پێوە بگرێت، ئەویش پێی فەرموو: ﴿قُلْ آمَنْتُ بِاللهِ ثُمَّ استَقِم﴾[١] واتە: بڵێ باوەڕدارم و لەسەری ڕاگیراوبە.

کەواتە، ڕەحمەتی خواتان لێ بێت بابە تێر و تەسەلی لە واتا و مەبەستەکانی (لاإله إلا اللّٰه) تێبگەین بۆ ئەوەی کاری پێ بکەین و لە سەریشی بەردەوام بین بە ئومێدی ئەوەی ئەهلی تەوحید بین و لە دواڕۆژیش بچینە بەهەشتی پان و بەرین، داوامان لە دوروست کاری بەهەشتە لە ئەهلی بەهەشتیان هەژمار بکات ئامین.

---

[١] - احمد ژمارەی فەرموودە: ١٥٤١٦

# فەرموودەی (١٨)

## کردار بەشێکە لە باوەڕ

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ أَوْ بِضْعٌ وَسِتُّونَ شُعْبَةً، فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَ الْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ﴾**[١] واتە: لە هاوەڵی بەڕێزەوە ئەبو هوریرە (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری سەروەرەوە ﴿ﷺ﴾ کە فەرموویەتی: باوەڕ حەفتا و شتێک یان شەست و شتێک بەشە، بەشی هەرە بەرزەکەی گوتنی: **(لاإله إلا اللّٰه)** یە و بەشە نزمەکەشی لابردنی ئازارێکە لەسەر ڕێگا و حەیاش بەشێکە لەباوەڕ.

**ڕوونکردنەوە:** واتە، باوەڕ پێک هاتووە لە کار و کردەوەی سێ ئەندام، دڵ و زوبان و کردارەکانی لاشە، هەر وەکو تێکرای زاناکانی ئەهلی سوننە و جەماعە فەرموویانە: لە پێناسەی باوەڕ ﴿**الإيمان يقين بالقلب وقول باللسان و تصديق بالعمل**﴾ واتە: باوەڕ دڵنیاییە لەناو دڵ و گوتنە بە زوبان و سەلماندیەتی بەکارو کردەوە.

چونکە فەرموودەکە باسی سێ شتی بۆ کردوینە یەکەمیان: (لاإله إلااللّٰه)یە،

---

[١] - بوخاری ژمارەی فەرموودە: ٩ . مسلم ژمارەی فەرموودە: ٣٥

ئەویش بە زوبان دەگوترێت. دووەمیان: لادانی ئازارە لەسەر ڕێگا ئەویش بە ئەندامەکانی لاشە ئەنجام دەدرێت وەکو لادانی جیلکە دڕکێك و بەردێك لەسەر ڕێگای موسوڵمانان.

سێیەم: حەیایە ئەوەش کرداری دڵە.

لەم فەرموودەیە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە تەنها بە گوتنی (لاإله إلا للّه) باوەڕی کەس تەواو نابێت تاوەکو نەیسەلمێنێت بە کار کردەوەکانی و دەبێت وشەی تەوحید بەئیخلاسیەوە بگوترێت چونکە زۆرن ئەوانەی دەڵێن(لاإله إلااللّه) بەڵام هەر یەکێک لەوان پاداشتێکی بۆ هەیە، کەسی وا هەیە دەڵێت: (لاإله إلااللّه) و بەخۆشی مولحیدە وەکو دوو ڕووەکانی هەموو سەردەمێک، و کەسی واش هەیە دەڵێت بەڵام لە تاوان ناگەڕێتەوە و کەسی واش هەیە دەڵێت بە یەقین و ئیخلاسەوە، ئەوە مەبەست تەواوە کە بە پاکی و ئیخلاسەوەیە چونکە ئیخلاس بناغەی هەموو کردەوەکانە وەکو لەم فەرموودەیە هاتوە

﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)أَنَّهُ قَالَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ فَقَالَ: لَقَدْ ظَنَنْتُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَنْ لَا يَسْأَلَنِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَحَدٌ أَوَّلُ مِنْكَ لِمَارَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الْحَدِيثِ,أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ خَالِصًا مِنْ قِبَلِ نَفْسِهِ﴾[1]

[1] - بوخاری ژمارەی فەرموودە: ٩٩

واتە: ئەبوهریرە (رضی الله عنه) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کێ بەختەورتین کەسە بە تکا کەت لە ڕۆژی دوایی؟ پێغەمبەری سەروەر (ﷺ) فەرمووی: دەمزانی هیچ کەسێک لە پێش تۆ ئەم پرسیارەم لێ ناکات، چونکە بینیم زۆر سوری لەسەر ئەم فەرموودەیە، خۆش بەخترین کەس بە تکاکانم لەڕۆژی دوایی، ئەو کەسەیە دەڵێت: (لاإله إلاالله) بە خاڵسی و دڵسۆزی لە ناخیەوە، کەواتە، دەبێت وشەی تەوحید بڵێن بە دڵسۆزی و کرداریش بەواتا و مەبەستەکانی بکەین بۆ سەلماندنی باوەڕمان، چونکە ئەگەر لە قوڕئانی پیرۆز ورد بینەوە دەبینین ئەو ئایەتانەی باسی باوەڕ دەکات یەک سەر باسی کردەوەی چاکەی لەگەڵ دەکات هەروەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[1]واتە: ئەوانەی باوەڕدارن و کار و کرداری چاکە ئەنجام ئەدەن بەڕاستی ئەوانن خاوەنی بەهەشت و تێیدا دەمێنەوە بە هەمیشەیی.

چونکە خوای گەورە هەڕەشەیەکی گەورەی کردوە لەو باوەڕدارانەی کردەوە بە گوفتارەکانیان ناکەن، هەر وەکو دەفەرمووێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَاتَفْعَلُونَ(٢)كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾[2] واتە: ئەی ئەوانەی

[1] - البقرة ٨٢
[2] - الصف ٣

باوەڕتان هێناوە بۆ شتێک دەڵێن و بەخۆشتان کاری پێ ناکەن بەڕاستی خوای گەورە زۆر تورە دەبێت کە شتێک دەڵێن و کرداری پێ ناکەن.

کەواتە، دەبێت هەوڵدەین بۆ ئەوەی بگەینە پلە بەرزەکەی باوەڕ چونکە ئەو پلەیە هەموو تاوانەکان لە ناو دەبات و خاوەنەکەی دەبێتە جێنشینی بەهەشت، ئەویش باوەڕ و کار وکردەوەی چاکەیە.

داوامان لە خوای گەورەیە کە هاوکاریمان بکات بۆ ئەوەی گوفتار و کردارمان بەگوێرەی باوەڕ و یەقینی ناو دڵمان بێت و خوای گەورە لە موتتەقین مان هەژمار بکات، ئامین.

# فەرمووودەی (١٩)

## نیشانەی باوەڕ

﴿عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَبْرٍ(رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾ قَالَ: آيَةُ الْإِيمَانِ حُبُّ الْأَنْصَارِ وَآيَةُ النِّفَاقِ بُغْضُ الْأَنْصَارِ﴾[١] واتە: عبداللَّهی کوری جبر (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) فەرمووی: گوێم لە ئەنەس بوو (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە پێغەمەری خواوە ﴿ﷺ﴾ کە فەرموویەتی: خۆشویسنی پشتیوانان (أنصار) نیشانەی باوەڕە و ڕق لێ بونەوەیان نیشانەی دووڕویە (نفاق).

**ڕوونکردنەوە:** بەڕاستی جێگای خۆیەتی ئەم ڕێز و پلەیە بە پشتیوانانی ئیسلام بدرێت هەر وەکو پاداشتێکی دونیایی پێش ئەوەی بگەنە خزمەتی بەدی هێنەری بونەوەر چونکە پیاوی تەنگانەبوون بۆ پاڵپشتی ئیسلام و پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ لەوکاتەی پێویستیان پێ بوو ئەوانیش بە شێوازێکی وا بەرگریان کرد کە لە مێژووی مرۆڤایەتی نەزانراوە بزانە ئەزیزەکەم خوای گەورە چۆن باسیان دەکات و ڕەزامەندی خۆی بۆیانی سەلماندوە هەروەکو دەفەرموێت:

﴿ قَد تَّابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ و الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِن بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾[٢]واتە:

---

[١] - بوخاری ژمارەی فەرموودە: ١٧

[٢] - التوبة ١١٧

سوێند بەخوا، بەڕاستی خوای گەورە تەوبەی قبوڵ کرد لە پێغەمبەر و کۆچبەران و پشتیوانان، ئەوانەی کە شوێنی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کەوتن لەکاتی سەغڵەتی و تەنگانەدا (لە غەزای تەبووکدا) دوای ئەوەی کە خەریک بوو دڵی دەستەیەکیان لە خشتە بچێت (بێزاری دەربڕێت) و لە وەودوا تەوبەو پەشیمانی ئەوانیشی قبوڵ کرد، چونکە بەڕاستی ئەو پەروەردگارە بەسۆز ومیهرەبانە لەگەڵیاندا.

کەواتە، بەبێ هۆ نەگەیشتونەتە ئەو پلەیە کە خۆشەویستنیان نیشانەی باوەڕ بێت و ڕق لێبونەوەیان دوو ڕویی بێت، چونکە ئەوەی لە دەستیان هات پێشکەشیان کرد تەنها لە بەرامبەر بەهەشت، یەک ڕووداوی پشتیوانان باس دەکەین بۆ ئەوەی بزانین چ جۆرە پیاوێک بوون بۆ ئیسلام، لە جەنگی حونەین پێغەمبەری پێشەوا ﴿ﷺ﴾ دەسکەوتەکانی بەسەر موجاهیدان دابەش کرد ئەوەی سەد مەڕ و ئەوەی پەنجا وشتر و ئەوەی سەد بزن بەڵام هیچ شتێکی نەدا بە پشتیوانان، وەکو لەم فەرمودە هاتووە: ﴿لَمَّا أَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ مَا أَعْطَى مِنْ تِلْكَ الْعَطَايَا فِي قُرَيْشٍ وَقَبَائِلِ الْعَرَبِ، وَلَمْ يَكُنْ فِي الْأَنْصَارِ مِنْهَا شَيْءٌ، وَجَدَ هَذَا الْحَيُّ مِنَ الْأَنْصَارِ فِي أَنْفُسِهِمْ، حَتَّى كَثُرَتْ فِيهِمُ الْقَلَةُ، حَتَّى قَالَ قَائِلُهُمْ لَقِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ قَوْمَهُ: فَدَخَلَ عَلَيْهِ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ هَذَا الْحَيَّ قَدْ وَجَدُوا عَلَيْكَ فِي أَنْفُسِهِمْ لِمَا صَنَعْتَ فِي هَذَا الْفَيْءِ الَّذِي أَصَبْتَ، قَالَ فَأَيْنَ أَنْتَ مِنْ ذَلِكَ يَا سَعْدُ ؟قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ مَا أَنَا إِلَّا امْرُؤٌ مِنْ قَوْمِي

قَالَ فَأَجْمَعْ لِي قَوْمَكَ فِي هَذِهِ الْحَظِيرَةِ قَالَ فَخَرَجَ سَعْدٌ،فَجَمَعَ النَّاسَ فِي تِلْكَ الْحَظِيرَةِ فَأَتَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ بِالَّذِي هُوَ لَهُ أَهْلٌ،ثُمَّ قَالَ يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ مَا قَالَةٌ بَلَغَتْنِي عَنْكُمْ وَجِدَةٌ وَجَدْتُمُوهَا فِي أَنْفُسِكُمْ؟ أَلَمْ آتِكُمْ ضُلَّالًا فَهَدَاكُمُ اللَّهُ ؟وَعَالَةً فَأَغْنَاكُمُ اللَّهُ؟وَأَعْدَاءً فَأَلَّفَ اللَّهُ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ؟ قَالُوا بَلِ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمَنُّ وَأَفْضَلُ قَالَ أَلَا تُجِيبُونَنِي يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ ؟قَالُوا وَبِمَاذَا نُجِيبُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟قَالَ أَمَا وَاللَّهِ لَوْ شِئْتُمْ لَقُلْتُمْ فَلَصَدَقْتُمْ وَصُدِّقْتُمْ أَتَيْتَنَا مُكَذَّبًا فَصَدَّقْنَاكَ، وَمَخْذُولًا فَنَصَرْنَاكَ، وَطَرِيدًا فَآوَيْنَاكَ، وَعَائِلًا فَآسَيْنَاكَ. أَوَجَدْتُمْ فِي أَنْفُسِكُمْ يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ فِي لُعَاعَةٍ مِنَ الدُّنْيَا تَأَلَّفْتُ بِهَا قَوْمًا لِيُسْلِمُوا،وَوَكَلْتُكُمْ إِلَى إِسْلَامِكُمْ أَفَلَا تَرْضَوْنَ يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالشَّاةِ وَالْبَعِيرِ، وَتَرْجِعُونَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ فِي رِحَالِكُمْ؟»[١] واتە: کە پێغەمبەری خۆشەویست ﴿ﷺ﴾ دەست کەوتەکانی حونەینی دەبەش کرد بەسەر قورەیش و عەرەبەکانی لەگەڵی بوون، هیچیشی لێ نەدا بە پشتیوانان خەریک بوو شتێک لە دڵی پشتیوانان دروست ببێت تاوەکو گوتیان پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ گەیشتە خزم و کەس و کاری خۆی: سەعدی کوڕی عوبادە(رضی اللەعنە) چوە خزمەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەو کۆمەڵە شتێکیان لە دڵدا دروست بووە بەرامبەر ئەوەی کە کردت، فەرمووی: ئەی تۆ چی دەڵێی ئەی سەعەد؟! سەعەد فەرمووی: منیش کەسێکم لە هۆزەکەم،

[١] - أحمد ژمارەی فەرموودە: ١١٧٣٠

پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەی سەعەد پشتیوانانم بۆ کۆکەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ چووە ناویان و حەمد و سوپاسی خوای گەورەی کرد و فەرمووی: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان شتێکم بیستوە ئایا شتێک چوە دڵتانەوە؟! ئایا نەهاتمە ناوتان ئێوە گومڕا بوون خوای گەورە بە هۆی منەوە ڕێنوێنی کردن؟ هەژار نەبوون خوای گەورە دەوڵەمەندی کردن؟ و دوژمن نەبوون خوای گەورە ئێوەی کرد بەدۆست؟ گوتیان: بەڵێ ئێمە منەت باری خوای گەورە پاشان پێغەمبەرەکەینە ﴿ﷺ﴾ ئەوجا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی: بۆ وەلامم نادەنەوە؟ گوتیان: بەچی وەلامت بدەینەوە؟ فەرمووی: سوێند بە پەروەردیگار ئەگەر ئێوە بڵێن ڕاست دەکەن و باوەڕیشتان پێ دەکرێت، پێم بڵێن ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هاتوویە لامان لە کاتێکدا قەومەکەت بە درۆزنیان خستبوی باوەڕمان پێت کرد و لە کاتێکدا لەلایەن قەومەکەت دژاتیت دەکرا پاڵپشتیمان لێ کردی و دەرکرابوی تۆمان لە خۆگرت و هەژار بووی دڵ نەواییمان کردی؟ ئەی کۆمەڵەی پشتیوانان، ئەوجا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی: شتێک چووە دڵتانەوە بۆ کەمێکی دونیا؟ دەسکەوتەکان دڵی کەسانێکم پێ ڕاگرد؟! ئێوەشم ڕادەستی باوەڕکەتان کرد، ئایا پێتان چۆنە خەڵک بزن و وشتر بباتەوە و ئێوەش پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەگەڵ خۆتان ببەنەوە؟ ئەوجا پێغەمبەری پێشەوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی:

﴿لَوْلَا الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنَ الأَنْصَارِ وَلَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِيًا وَشِعْبًا لَسَلَكْتُ وَادِيَ الأَنْصَارِ وَشِعْبَهَا﴾[1] واتە: ئەگەر لەبەر گەورەیی پاداشتی کۆچکردن نەبوایە؟ دەبومە یەکێک لە پشتیوانان، ئەگەر هەموو خەڵک بە دۆل و ڕێگایەک بڕۆن و پشتیوانانیش بە ڕێگایەکی تر بڕۆن، ئەوە بە ڕێگای پشتیواناندا دەڕۆیشتم.

ئەوجا لە کۆتایش فەرمووی: ﴿ أَللَّهُمَّ ارْحَمِ الأَنْصَارَ، وَأَبْنَاءَ الأَنْصَارِ، وَأَبْنَاءَ أَبْنَاءِ الأَنْصَارِ﴾[2] واتە: خوایە بەزەییت بێتەوە بە پشتیوانان و منداڵەکانی پشتیوانان و نەوەکانی پشتیوانان.

ئەمە دلۆپێکە لە دەریاییەکی چاکە و فەزڵی پشتیوانان و گەورەی بڕوایان، دەڵێین یاربی خوایە خۆشەویستی پشتیوانان و سەرجەم تێکۆشەرانی ئیسلام لە دڵمان بچەسپێنی و بمانکەیە خۆشەویستانی پشتوانان و لەگەڵ ئەواندا حەشرمان بکەی ئامین.

[1] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٣٧٧٨

[2] - احمد ژمارەی فەرموودە: ١١٧٣٠

## فەرموودەی (٢٠)

## باوەڕداری تەواو کێیە

**﴿عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾ قَالَ: لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ﴾**[1] واتە: لە هاوەڵی خۆشەویستەوە ئەنەسی کوڕی مالیک (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە پێغەمبەری مەزنەوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: بەڕاستی هیچ کەسێکتان باوەڕدارنینە تاوەکو ئەوەی بۆخۆتان پێتان خۆشە بۆ براکەشتان خۆش نەبێت.

**ڕوونکردنەوە:** بەڕاستی ئەم فەرموودەیە و هاوشێوەکانی بناغەو بنچینەکانی برایەتی دادەمەزرێنن و حەسوودیی و ڕق و کینە ناهێلێن لە ناو کۆمەڵگای موسوڵمانان، چونکە موسوڵمانان دەبێت هەست بە حاڵ و گوزەرانی یەکتری بکەن هەر خۆشییەک هەبێت بۆ یەکتریان بوێت و داوا لە خوای گەورە بکەن کە هەر خراپە و ناڕحەتیەک هەبێت لە بڕواداران بە دووربێت بەڵام بەداخەوە بەناو موسوڵمان دەبنە هۆی ئازار و خراپە بۆ بڕواداران کەواتە، دەبێت هەوڵ بدەین بۆ ئەوەی نەبینە کێشە و گرفت بۆ بڕواداران و زۆریش بترسێین نەوەک ببینە هۆکاری نارحەتیان چونکە خوای گەورە هەڕەشەیەکی توند لەو کەسانە دەکات

[1] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ١٣

کە ئەزیەت ئازاری بڕواداران دەدەن بەبێ هیچ هۆیەک هەر وەکو فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُّبِينًا﴾[1] واتە: ئەوانەی ئازاری پیاوانی و ژنانی ئیماندار دەدەن بێ هیچ تاوانێک کردبێتیان بێگومان ئەوانە درۆو بوختان و گوناحی ئاشکرایان هەڵگرتووە.

بۆ هیچ باوەڕدارێکیش ڕەوا نیە بە چاوێکی سوک تەماشای موسوڵمانان بکەن یان تان لە یەکتری بدەن و ناو و ناتۆرەی ناشرین بۆیەک تر ببینەوە هەروەکو خوای باڵادەست فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَى أَن يَكُونُوا خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِّن نِّسَاءٍ عَسَى أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ﴾[2] واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! با هیچ پیاوێکتان گاڵتە و مەسخەرە بە پیاوێکی تر نەکات لەوانەیە گاڵتە پێکراوەکان (لای خوای گورە) لە گاڵتەچیەکان بەڕێزتربن و هەروەها با ئافرەتیش گاڵتە بە ژنانی تر نەکەن چونکە لە وانەیە ژنە گاڵتە پێکراوەکان(لای خوای گەورە) لە گاڵتەچییەکان باشتربن، تەرازووی چاکیی و، خراپیی تەنها لای خوای زانا و دانایە.

چونکە ئەم سیفەتە دەبێتە کیبر و لە خۆبایی بون کیبریش، هۆکاریک نەچونە بەهەشتە هەروەکو پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ لە بارەیەوە دەفەرمووێ:

---

[1]- الأحزاب ٥٨

[2] - الحجرات ١١

﴿لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ قَالَ رَجُلٌ: إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَنًا وَنَعْلُهُ حَسَنَةً إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ الكِبْرُ بَطَرُ الحَقِّ، وغَمْطُ النَّاسِ﴾[1] واتە: هەرکسێك تۆسقالە زەڕەیەک کیبری لە دڵ بێت ناچتە بەهەشەوە. پیاوێک گوتی باشە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر کەسێک پێی خۆش بێت پۆشاکی جوان بێت و پێلاوی جوان بێت ئایا ئوە کیبرە؟ پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە جوانە و جوانیشی پێ خۆشە، بەڵام کیبر ڕەتکردنەوەی حەق ڕاستیە و سەیر کردنی خەڵکە بە چاوێکی سوک.

چونکە ئەم کارە دەبێتە هۆی عوجب و سەرسامبون بەخۆ و گومانی چاکبەخۆ بردن خوای گەورەش ڕێگیری ئەم شتەی لێکردوینە هەر وەکو فەرموویەتی: ﴿فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى﴾[2]واتە: خۆتان بەچاک و باش ناو نەبەن چونکە هەر بەخۆی دەزانێت کێتان تەقوادارە.

کەواتە، چیمان بۆ خۆمان پێ خۆش بێت لە ماڵ و منداڵ و خۆشی دونیا و دوا ڕۆژ دەبێت بۆ هەموو موسوڵمانیکیش پێمان خۆش بێت و هەرشتێکمان بۆخۆمان پێ ناخۆش بێت بەهەمان شێوە دەبێت بۆ هەموو موسوڵمانان پێ ناخۆش بێت چونکە بڕواادارانی ڕاستەقینە خۆشی و ناخۆشی یەکتر بە هی خۆیان دەزانن هەر وەکو خوای گەورە فەرموویەتی:

---

[1] - مسلم ژمارەی فەرموودە: ٩١

[2] - النجم ٣٢

﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾[1] واتە: تەنها بڕواداران بران کەواتە, سولح و ئاشتی لەنێوان براکانتان بکەن بۆ ئەوەی سەرفەرازبن.

کەواتە، ئەی شوێنکەوتوانی (محمد)کاتی خۆیەتی دڵمان پاک بکەینەوە لە بەرامبەر یەکتری و بوغز و ناحەزی بڕواداران لە دڵمان دەربێنین بە ئومێدی ئەوەی ببین بەبرای ڕاستەقینەی ئیمانی چونکە وەسیەتی پێغەمبەری خوایە ﴿ﷺ﴾ بۆ هەموو ئوممەتەکەی هەروەکو فەرموویەتی: ﴿كُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا﴾[2] واتە: ببن بە برا وەکو بەندەکانی خوای گەورە.

چونکە ئەگەر بوین بە برا لەسەر بڕوا و عەقیدەیەکی پاک ئەوە دوور دەبین لە ئازار دانی یەکتری هەروەها لەدوا ڕۆژیشدا دەبین بە پاڵپشت و تکاکار بۆ یەکتر وەکو پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کە باسی باوەرداران دەکات لەوکاتەی لە پردی سیرات دەپەڕنەوە و دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا رَأَوْا أَنَّهُمْ قَدْ نَجَوْا فِي إِخْوَانِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا إِخْوَانُنَا كَانُوا يُصَلُّونَ مَعَنَا، وَيَصُومُونَ مَعَنَا وَيَعْمَلُونَ مَعَنَا فَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى اذْهَبُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ دِينَارٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجُوهُ﴾[3] واتە: لەو کاتەی بڕواداران لە پردی سیرات دەپەڕنەوە و دەبینن براکانیان مانەوە هاوار

---

[1] - الحجرات ١٠

[2] - البخاری ژمارەی فەرموودە: ٦٠٦٤

[3] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٧٤٣٩

دەکەن و دەڵێن ئەی پەروردیگارە براکانمان ئەوانەی لەگەڵ ئێمە نوێژیان دەکرد و لەگەڵمان بەڕۆژو دەبون و لەگەڵ ئێمە کاری چاکیان ئەنجام دەدا، خوای گەورە دەفەرموێت: دەبڕۆن ئەوەی بەقەد دینارێک بڕوای لەدڵدا هەبێت دەریبێنن.

واتە، برایەتی لەسەر بنەمای ئیمان سوودی دونیا ودوا ڕۆژیش هەیە بۆ موسوڵمانان.

داوامان لە خالقی ئاسمان و زەویە لەتاوان و هەڵەکانمان خۆش ببێت و بمانکات بە بڕواداری ڕاستەقینە، ئامین.

# فەرموودەی (٢١)

## تەواوبوونی باوەڕ

**﴿عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رضي الله عنه)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ، وَأَبْغَضَ لِلَّهِ، وَأَعْطَى لِلَّهِ، وَمَنَعَ لِلَّهِ ؛ فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الْإِيمَانَ﴾**[١] واتە: لە هاوەڵی ئەزیزەوە باوکی ئومامە (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە پێغەمبەری گەورەوە (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێک خۆشەویستی لەپێناو خوای گەورە بێت و ڕق لێبونەوەشی لەپێناو خوای گەورە بێت و بە خشینەکەی لەپێناو خوای گەورە بێت و گرتن و نە بەخشینەکانی هەر لەپێناو خوای گەورە بێت ئەوە بەڕاستی گەیشتوتە تەواوی باوەڕ.

**ڕوونکردنەوە:** واتە، موسوڵمان دەبێت ئەوشتانەی خۆش بوێت کە خوای گەورە خۆشی دەوێت چونکە لەبەر خوای تعالی خۆشی ویستوە و دەبێت خۆی لەو شتانە بە دوور بخاتەوە کە خوای باڵادەست خۆشی ناوێت ئەوجا رقی لەو شتانە ببێتەوە کە خوای پەروەردیگار خۆشی ناوێت، چونکە لەبەر خوای گەورە ڕقی لێ دەبێتەوە و دەبێت هەموو بەخشینەکانی لە پێناو خوای مێهرەبان بێت چونکە ئەگەر لەپێناو هەر شتێک ببەخشێت تەنها ئەوەی بەدەست دەکەوێت

---

[١]- أبو داود ژمارەی فەرموودە: ٤٦٨١

بەڵام باوەڕدار ڕەزامەندی خوای موتەعالی مەبەستە واتە؛ دەبێت تەنها لە پێناو خوای بەخشندە ببەخشێت بۆ ئەوەی ببێتە جێگای ڕەزامەندی خوای گەورە؛ و دەبێت هیچ شتێک خەرج نەکەین لەسەرپێچی فەرمانەکانی خوای گەورە پاشان پێغەمبەری خۆشەویست، ئەم فەرمودەیە فێرمان دەکات بۆ ئەوەی لەسەر هەموو ژیانمان پاداشت وەربگرین چونکە ئەم فەرمووده پیرۆزە هەردوو جۆرە کرداری کۆکردوتەوە کردەوەی دڵ ئەویش بریتیە لە خۆشویستن و ڕق لێ بونەوە، و کردەوەی ئەندامەکانی لاشە، ئەویش بریتیە لە بەخشین و نەبەخشین، کەواتە، خۆشەویستان با هەموو ژیانمان لەپێناو خوای بەخشندە بێت و بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا بەخشندە بێت هەروەکو فەرمانمان پێ کراوە چونکە ئێمە بەندەین، بەندەش جێبە جێ کاری فەرمانەکانی گەورەکەیەتی گەورەی ئێمەش خوای باڵا دەستە؛ فەرمانمان پێ دەکات لە ژێر فەرمانەکانی خۆی بژین هەر وەکو فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَ مَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّـهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.. لَا شَرِيكَ لَهُ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾[1] واتە ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەی ئیماندار بڵێ بەڕاستی نوێژ و حەج و دروشمەکانی و سەرجەم چاکە و بەندایەتیم هەروەها ژیان و مردنیشم تایبەتە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە و هیچ هاوەڵێکی بۆ نییە هەر بەوەش فەرمانم پێکراوە و

[1] - الأنعام١٦٢-١٦٣

دەبێ هەر لە پێناو خوای گەورە بژییم و بمرم و من یەکەم کەسیشم لەڕیزی موسڵمانانی ئەم ئوممەتەدا.

چونکە هەر کەسێک بێ باوەڕ بێت و ژیان و مردنی بۆ خوای بونەوەر نەبێت بونی ئەو لەسەر زەوی هەر وەکو ئاژەڵە، هەر وەکو خوای گەورە دەربارەی بێ باوەڕان فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ﴾[1] واتە: ئەوانەی بێ باوەڕبوون، لەزەت ئەبەن و ئەخۆن لە دونیادا هەر وەک ئاژەڵ دەخۆن و بیری هیچ شتێکیان لا نیە ئاگریش جێگایە بۆیان.

واتە: چەند ڕۆژێ رائەبوێرن بەڵام سەرەنجامیان دۆزەخە، چونکە باوەڕدار مەبەستی لە خۆراک ئەوەیە بەهۆیەوە بژیت بەڵام کافر و بێ باوەڕان هەموو هیوایەتیان لە ژیان تێرکردنی زک و دامێنیانە، بەڵام مرۆڤی باوەڕدار دەبێت مەبەستی سەرەکی لە ژیان بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای باڵادەست بێت، با تەماشای هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بکەین بزانین خوای بێ هاوتا چۆن باسیان دەکات لە قورئان ﴿الَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا﴾[2] واتە: ئەو کەسانە لەگەڵ پێغەمبەرن ﴿ﷺ﴾ لە بەرامبەر بێ باوڕان ئازا و توند و بەهێزن، لە ناو خۆشیاندا میهرەبان و بە سۆزو دڵ نەرمن دەیانبینیت هەردەم خەریکی ڕکوع و سەجدەن، واتە: زۆر

---

[1] - محمد ١٢

[2] - الفتح٢٩

خەریکی خواپەرستیی و نوێژن، بە شەو، شەو نوێژ دەکەن و بە ڕۆژیشدا سوار چاکیی مەیدانن، هەموو مەبەستیشیان هەموو کات ئاواتیان بەدەست هێنانی فەزڵ و بەهرە و میهرەبانی خوای باڵادەستە.

مەبەستیان ئەوەیە خوایان لێ ڕازیی بێت، چونکە ئەگەر بۆ خوای گەورە نەژین و دینەکەی خۆمان وەکو خۆی پەیرەو نەکەین؟ خوای گەورە هەڕەشەیەکی توندمان لێ دەکات و دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ﴾[1] واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! هەر کەسێک لە ئێوە لە ئایینی خۆی، واتە لە دینی ئیسلام پاشگەز ببێتەوە و هەڵگەڕێتەوە خوای بێ گەرد لەمەولا کەسانێک دێنێت، ئەوەندە بەرفەرمانی دەبن خۆشی دەوێن و ئەوانیش ئەویان خۆشدەوێ و لە ئاستی باوەڕداران خۆ بەکەمزان و بە سۆزن و لە بەرامبەر کافر و بێ باوەڕان خۆ بە گەورەزان و سەربڵند و دەروونبەرز و توندوتیژ و بە هەڵمەتن بۆ ڕەزامەندی خواش تێدەکۆشن و جەنگ دەکەن و لە تەعن و لۆمەی لۆمەکەرانیش ناترسن و باکیان نابێت.

کەواتە، با هەوڵبدەیەن بۆ دوا ڕۆژمان بکەین وبڵێین یارەبی موەفق و پالپشت وکۆمەکمانبی بو ئەوەی هەموو ژیان ومردنیشمان بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت ئامین.

---

[1] - المائده ٥٤

# فەرموودەی (٢٢)

# بەهێزترین گرێیەکانی باوەڕ

﴿قال: رسول اللَّه ﴿ﷺ﴾ أوثق عرى الإيمان الموالاة في اللَّه والمعاداة في اللَّه والحب في اللَّه والبغض في اللَّه﴾[١] واتە: خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: توند ترین گرێیەکانی باوەڕ خۆشەویستیە لە پێناو خوای گەورە و ڕق لێبونەوەیە لە پێناو خوای گەورە.

**ڕوونکردنەوە:** دەبێت بڕواداران یەکتریان خۆش بوێت و تەنهاش لە پێناو خوای گەورە بێت خۆشەویستیان ئەوجا هەر کەسێک تەقوا و خواپەرستی زیاتربێت لای بڕواداران خۆشەویستر دەبێت، بۆیە دەبێت خۆشویستن و ڕق لێ بونەوە بە پەرستن بزانین چونکە واجبە، شێخی ئیسلام إبن تيمية (رحمه‌الله) دەفەرموێت: ﴿ و ليُعلم أنَّ المؤمن تجب موالاته وإن ظلمك واعتدى عليك والكافر تجب معاداته وإن أعطاك وأحسن إليك فإن اللَّه سبحانه بعث الرسل وأنزل الكتب ليكون الدين كله للَّه فيكون الحب لأوليائه والبغض لأعدائه﴾[٢] واتە: دەبێت باوەڕدارمان خۆش بوێت ئەگەر ستەم و تەعداشی لێ کردین، و

---

[١] - (الألباني؛ السلسلة الصحيحة،٩٩٨

[٢] - مجموع الفتاوى ٢٠٩/٢٨

دەبێت ڕقمان لە کافر بێت ئەگەر چاکەشی بۆمان هەبێت، خوای گەورە پێغەمبەرانی ڕاوانە کردوە بۆ ئەوەی دین هەر هەمووی بۆ خوای گەورە بێت.

واتە: خۆشویستنی خۆشەویستانی خوای گەورە و ڕق لێ بونەوەی دوژمنانی، چونکە هەر کەسێکمان خۆش بوێت لەگەڵ ئەو حەشرو حیسابمان دەکرێت، هەر وەکو سەروەرمان ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ﴿الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ﴾[1] واتە: مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسە دەبێت کەخۆشی دەوێت.

ئینجا هاوەڵی ئازیز ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرمووێت: ﴿فَمَا فَرِحْنَا بِشَيْءٍ بَعْدَ الإِسْلَامِ، فَرَحَنَا بِقَوْلِ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾ إِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ، فَأَنَا أُحِبُّ رَسُولَ اللهِ وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ؛ وَأَنَا أَرْجُو أَنْ أَكُونَ مَعَهُمْ؛ لِحُبِّي إِيَّاهُمْ وَإِنْ كُنْتُ لاَ أَعْمَلْ بِعَمَلِهِمْ﴾[2] واتە: ئەنەس دەفەرمووێت: دڵمان بە هیچ شتێک خۆش نەبووە لە دوای ئیسلام وەکو دڵ خۆشیمان بەم فەرموودەیە چونکە من پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و ئەبو بەکر و عومەرم خۆش دەوێت و داواشم وایە لەگەڵیان بم ئەگەر کرداریشم وەکو کرداری ئەوان نەبێت.بیزانە ڕەحمەتت لێبێت خۆشەویستی لە پێناو خوای گەورە هۆکاری بەدەست هێنانی خۆشەویستی خوایە هەر وەکو لەم فەرموودە قودسیە هاتوەکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَجَبَتْ مَحَبَّتِي لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ﴾[3]

---

[1] - البخاري ژمارەی فەرموودە: ٦١٦٨

[2] - أحمد ژمارەی فەرموودە: ١٣٤١٩

[3] - أحمد ژمارەی فەرموودە: ٢٢٠٣٠

واتە:خوای گەورە دەفەرموویت: خۆشەویستی من واجب بوو بۆ ئەو کەسانەی لە پێناو من یەکتریان خۆش ویستوە.

بە پێچەوانەوە دەبێت ڕقمان لە بێ باوەڕان بێت لە بەر کردارە کوفری و خراپەکانیان نەک لە بەر خودی خۆیان وەکو مرۆڤ چونکە ئەم خاڵە دروشمی یەکخواپەرستانە، خوای گەورە پێغەمبەر ئیبراهیمی (علیه السلام) و ئەوانەی لەگەڵیدا کردۆتە پێشەنگ بۆمان هەروەکو فەرموویەتی: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾[1] واتە: بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە ئەی ئیمانداران لە ئیبراهیم و ئەوانەی بڕوایان هێنابوو لەگەڵیا سەر مەشقییەکی چاک و جوان، لەوکاتەی بە هۆزەکەی(کافری) خۆیان گوت بەڕاستیی ئێمە بێزار و بەریین لە خۆتان و لەو پەرستراوانەی جگە لە خوای گەورە دەیانپەرستن.

کەواتە، نابێت کەمترین خۆشەویستیمان هەبێت بۆ دوژمنانی خوای بێ هاوتا, نەوەک لەگەڵیان توشی خەشم و عەزابی خوای خاوەن عەرش ببین پەنا بەخوای گەورە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلاَتَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾[2] واتە: نابێت کەمترین خۆشەویستیتان هەبێت بۆ ستەمکاران ئەگەرنا لەگەڵ ئەوان توشی ئاگر دەبن.

---

[1] - الممتحنة ٤

[2] - هود ١١٣

چونکە، ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَ جُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ﴾[1] واتە: بەڕاستی فیرعەون و هامان و لەشکر و سەربازەکانیان تاوانبار و هەڵەبوون.

خوای گەورە حوکمی هەموانی وەکو یەک داناوە چونکە بە پاڵ پشتی هەمووان خراپەکە ئەنجام دەدرا، کەواتە با ئاگاداری خۆمان بین و بشزانین کێمان خۆش بوێت ئەوە لە گەڵ ئەوان حەشر دەکرێین، داوامان لە خوای گەورەیە لەگەڵ ئەسحاب و پێشەواکەیان کە پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ حەشرمان بکات ئامین.

---

[1] - القصص ٧

# فەرمووده‌ی (٢٣)

# نوێکردنەوەی باوەڕ

**﴿عن عبد اللّٰه بن عمرو (رضي الله عنهما) قال: قال رسول اللّٰه ﴿ﷺ﴾ إن الإيمان ليخلق في جوف أحدكم كما يخلق الثوب، فاسألوا اللّٰه أن يجدد الإيمان في قلوبكم﴾**[١]
واتە: لە هاوەڵی بەڕێزەوە عبداللّٰەی کوری عەمرو (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە خۆشەویستی گەورەوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: بەڕاستی باوەڕ لە ناختان کۆن دەبێت هەر وەکو چۆن جل و پۆشاک کۆن دەبێت کەواتە داوا لە خوای گەورە بکەن بۆ ئەوەی باوەڕ لە دڵەکانتانەوە نوێ بکاتەوە.

**ڕوونکردنەوە:** بزانە ڕەحمەتی خوات لێ بێت پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ نموونەی شتێکی نادیارمان بۆ دەهێنێتەوە بە شتێکی بەرچاو چونکە بەداخەوە زۆرێک لە خەڵک زانا و دانان لە بوار و گۆزەرانی دونیا بەڵام زۆر نەزان و نەفامن لە زانستی قیامەت هەر وەکو خوای باڵادەست زەمی کەسانێک دەکات و دەفەرمووێت: **﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِرًامِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ﴾**[٢]
واتە: زۆر کەس هەن زانا و شارەزان لە ڕواڵەتی دونیا بەڵام لە بواری قیامەت و ڕۆژی کۆتایی بێ ئاگان.

[١] - صحيح الجامع ژمارەی فەرموودە: ١٥٩٠
[٢] - الروم ٧

واتە چۆن خانووەکان ماوە ماوە خاوەنەکەی کەم و کوڕیەکانی چاک دەکاتەوە و بۆیاغی دەکاتەوە بۆ ئەوەی کۆن نەبێت بیروباوەڕیش ئاوا پێویستی با تازە کردنەوەیە چونکە هەور و ڕەشای تاوان سەقفی دڵەکان دادەپۆشن ئەوجا ئەگەر خاوەنەکەی خاوێنی نەکاتەوە بە ئیستغفار و تەوبە و کاری چاکە ئەم دڵە ڕەش دەبێت و تاریکی دایدەپۆشێت هەر وەکو پزیشکی دڵان پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا أَخْطَأَ خَطِيئَةً نُكِتَتْ فِي قَلْبِهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، فَإِذَا هُوَ نَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ وَتَابَ سُقِلَ قَلْبُهُ، وَإِنْ عَادَ زِيدَ فِيهَا حَتَّى تَعْلُوَ قَلْبَهُ، وَهُوَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ {كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾[1] واتە: ئەگەر بەندە هەڵەیەکی کرد و تاوانێکی ئەنجام دا خاڵێکی ڕەش لە سەر دڵی دەکرێت ئەگەر وازی هێنا و تەوبەی کرد و داوای لێخۆشبونی لە خوای گەورە کرد پاك و خاوێن دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر گەڕاوە و دەستی بەتاوان کردەوە خاڵەکە گەورە دەبێت تاوەکو هەموو دڵی دادەپۆشێت (پەنا بەاللّه) ئەوجا فەرمووی: ئەمە ئەو داپوشینەیە کە خوای گەورە باسی کردوە، لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾[2]واتە: دڵەکانیان داپۆشران بەهۆی کردەوەکانیان.

---

[1] - الترمذي ژمارەی فەرموودە: ٣٣٣٤

[2] - المطففين ١٤

کەواتە، با بەخۆماندا بچینەوە و بیزانین باوەڕمان لە زیاد بونە یاخود لە کزی و و لاوازیە؟

هەروەکو ریوایەت کراوە لە ئەبو درداوە (رضی اللەعنە)کە دەیفەرموو: ﴿إن من فقه العبد أن يتعاهد إيمانه ومانقص معه ومن فقه العبد أن يعلم أيزداد الإيمان أم ينقص وأن يعلم نزغات الشيطان أنى تأتيه﴾[1]واتە: لە ژیری و تێگەیشتنی بەندە ئەوەیە کە بە بەردەوام بە باوەڕەکەی خۆیدا بچێتەوە و بزانێت چ لێی کەمی کردوە، دەبێت بیزانێت ئایا باوەڕەکەی زیاد دەکات یاخود کەم دەکاتەوە و بیزانێتیش فێلەکانی ئیبلیس و بزانێت ئیبلیس لەچ ڕێگایەک بۆی دێت.

خوای گەورە نموونەی باوەڕی بە درەختی بەردار هێناوەتەوە و دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ﴾[2] واتە: ئایا نەتانبینیوە و نەتانزانیوە چۆن خوای گەورە نموونە دەهێنێتەوە بە درەختێکی بەردار ڕەگەکەی بەتوندی داکوتراوە لە زەوی ولق و پۆپەکانیشی بەئاسماندا بڵاوبونەتەوە.

ئیبن عەباس ڕەزا و ڕەحمەتی خوای گەورە لە خۆی و باوکی بێت دەفەرمووێت: ﴿كلمة طيبة﴾ واتە: لاإله إلاالله ﴿أصلها ثابت﴾[3] واتە: لە دڵی باوەڕدار.

بێگومان درەختیش ئەگەر ئاو نەدرێت ووشک دەبێتەوە.

---

[1] - شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة/ ١٧١٠

[2] - ابراهيم ٢٤

[3] - تەفسیری ئیبن کەثیر

باوەڕیش بە هەمان شێوەیە، هەروەکو بزیشکی دڵان إبن القیم دەفەرمووێت:
﴿بسقيها كل وقت بالعلم النافع والعمل الصالح والعود بالتذكر على التفكير والتفكر على التذكر و إلا أوشك أن تيبس﴾[1] واتە: ئاودانی باوەڕ هەموو کات بە زانستی بەسوود و کاری چاک و بیرکردنەوەی بەردەوام دەبێ ئەگەر نا ووشک دەبێت.

کەواتە، پێویستە ئاگاداری باوەڕی خۆمان بین و لەو شتانەی دوور بکەوینەوە کە دەبێتە هۆی لەناو بردنی باوەڕمان یاخود دەبێتە هۆی کەمبونەوەی باوەڕمان، ئەویش گوناح و تاوانە، تاوانیش یان باوەڕ لەناو دەبات وەکو کوفر و شیرک پەنا بە خوای گەورە، یان لاوازی دەکات ئەویش هەموو تاوانێک دەگرێتەوە جگە لە شیرک و کوفر.

داوامان لە خوای گەورەیە کە بمرین بە باوەڕێکی تەواو و لە ژێر پەیداخی **(لاإله إلا اللّٰه محمد رسول اللّٰه)** حەشرمان بکات ئامین.

---

[1] - إعلام الموقعين:/١/١٧٤/

# فەرموودەی (٢٤)

# کاری بڕوادار

﴿عَنْ صُهَيْبٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ عَجَبًا لأَمْرِ الْمُؤْمِنِ، إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ، وَلَيْسَ ذَاكَ لأَحَدٍ إِلاَّ لِلْمُؤْمِنِ ؛ إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ﴾[١] واتە: لە هاوەڵی بەڕێز سوهەیبی ڕومی (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری شکۆمەندەوە ﴿ﷺ﴾ کە فەرموویەتی: بەڕاستی کار و باری باوەڕدار جێگای سەرسوڕمانە چونکە هەموو کارە و کردەوەی خێرە بۆی و بۆ هیچ کەسی دیکە نیە ئەمە تەنها بۆ باوەڕدارە چونکە ئەگەر توشی خۆشی و فەرحنای بێت شوکرانە بکات ئەمە بۆی بەخێر دەنووسرێت و ئەگەر توشی نارەحەتی و ناخۆشی ببێت و سەبری لەسەر بگرێت ئەویش هەر بۆی بەخێر دەنوسرێت.

**ڕوونکردنەوە:** ئەم فەرموودەیە ئاگاداری ئێمەی باوەڕدار دەکاتەوە بۆ ئەوەی بزانین ئیمان و باوەڕ چ بەها و نرخێکی هەیە، چونکە بەهۆی باوەڕکەوەیە خۆشی و ناخۆشی هەر بە چاکە و بە خێر بۆ مرۆڤی باوەڕدار دەنووسرێت، هەروەکو دەفەرمووێت: ئەمە بۆ هیچ کەسێک نیە تەنها بۆ بڕوادارە، بەو مەرجەی داوای

---

[١] - مسلم ژمارەی فەرموودە: ٢٩٩٩

پاداشتەکەی لە خوای گەورە بکات، موعازی کوڕی جەبەل (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) بەشێکی شەو دەخەوت و بەشێکی شەویش شەو نوێژی دەکرد، ئەوجا دەیفەرموو: ﴿فَأَحْتَسِبُ نَوْمَتِي كَمَا أَحْتَسِبُ قَوْمَتِي﴾[1] واتە: داوام لە خوایە خەوتنەکەشم بۆ بەخێر بنووسێت هەروەکو داوای خێری شەو نوێژەکەی لێ دەکەم. ئەم فەرموودەیە باوەڕمان بۆ دەکات بە دوو بەشەو نیوەی سەبر وئارامیە و نیوەشی شوکر و سوپاسی خوایە، کەواتە، باخۆمان بپشکنین ئەگەر لە ناخۆشی و تەنگانە سەبرو ئارامیمان هەبوو و چاوەڕوانی فەرحنایی بووین لە خوای گەورەو و داوای پاداشتەکەشمان هەر لە خوا دەکرد و لەکاتی خۆشی سپاس گوزار بوین با چاوەڕوانی زیادبوون بین چونکە خوای باڵادەست فەرموویەتی: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾[2] واتە: ئەگەر لەبەرامبەر نیعمەتەکانمەوە سوپاسگوزاریی بکەن ئەوە منیش نیعمەت و بەخششی خۆمتان بۆ زیاد دەکەم. واتە بەڵام هەموو سپاسێک سپاسێکی دیکەی پێویستە چونکە سپاس کردنیش نیعمەتی خوایە، کەواتە، هەموو ژیانی بڕوادار خێرە ئەگەر بۆ خوا بژیت هەر ئەمەش داواکراوە لە مرۆڤی باوەڕدار، خوای باڵادەست فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کردوە و لە ڕێگای ئەوەوە فەرمانی بە هەموو بڕوادارێک کردوە و فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَ مَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ

[1] - البخاری ژمارەی فەرموودە: ٤٢٤٣

[2] - ابراهیم ٧

الْعَالَمِينَ ... لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾[١] واتە: ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە ئوممەتەکەت بڵێ بەڕاستی نوێژ و دوعا و هەموو چاکە و تێکڕای ژیان و مردنیشم تەنها بۆ خوای پەروەردیگاری جیهانیانە بەبێ هاوبەش و هاوتا وە هەر بەوەش فەرمانم پێ کراوە و من یەکەمین موسوڵمانانم.

ئەگەر پێغەمبەری مەزن ﴿ﷺ﴾ ئەم فەرمانەی پێ بکرێت دەبێت ئێمە زیاتر پابەندبین؛ چونکە ئێمە زۆر زیاتر پێویسە تەسلیمی فەرمانەکانی خوابین لە بەر هەڵە و تاوانە زۆرەکانمان چونکە ئێمە خۆمان بەشوێنکەوتەی ئەم پێغەمبەرە گەورەیە﴿ﷺ﴾ دەزانین؛ و إن شاءاللَّه هەر بە شوێنکەوتەی ئەم پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ هەژمار دەکرێین کەواتە، دەبێت وەکو پێغەمبەرمان ﴿ﷺ﴾ بانگەوازی بکەین چونکە خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرە ئازیزەکەی کردوە ﴿ﷺ﴾ و فەرموویەتی: ﴿قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي﴾[٢] واتە: ئەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بڵێ بەڕاستی ئەمە ڕێگای منە بانگەوازی دەکەم بۆ لای خوای بێ هاوتا بە بەڵگە و بەرچاوڕونی من و شوێنکەوتوەکانم. بۆیە بڕواداری ڕاستەقینە دەبێت خۆی یەک لا بکاتەوە بۆ خوای گەورە (جل جلاله) بۆ ئەوەی پاداشت لەسەر هەموو ژیانی وەربگرێت، داوام لە خوای گەورەیە (جل جلاله) لە بەندە چاکەکانی هەژمارمان بکات ئامین.

---

[١] - ١٦١ /الأنعام
[٢] - يوسف ١٠٨

## فەرموودەی (٢٥)
## جیاوازی کاری دڵ و زوبان

﴿عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ يَا مَعْشَرَ مَنْ آمَنَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يَدْخُلِ الْإِيمَانُ قَلْبَهُ، لَا تَغْتَابُوا الْمُسْلِمِينَ وَلَا تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ فَإِنَّهُ مَنِ اتَّبَعَ عَوْرَاتِهِمْ يَتَّبِعُ اللَّهُ عَوْرَتَهُ وَمَنْ يَتَّبِعِ اللَّهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ فِي بَيْتِهِ﴾[١] واتە: لە ئەبو بەرزەی ئەسلەمی (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە پێغەمبەری خۆشەویستەوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە بە زوبان بەڵام باوەڕ نەچووتە ناودڵتانەوە غەیبەتی موسوڵمانان مەکەن و بەدوای عەیب و عاریان مەگەون چونکە هەر کەسێک بەدوای عەیب و عاری باوەڕداران بگەوێت خوای گەورە عەیب وعاری بۆ خەڵک دەردەخات.

**ڕوونکردنەوە:** بەڕاستی ئیسلام دینی ڕەوشت جوانی و پاراستنی کەم و کوڕی موسوڵمانانە، چونکە، نابێت عەیب و عاری موسوڵمانان لە کەدار بکەین چونکە دەبێتە مایەی لێک ترازان و ناحەزی نێوان موسوڵمانان، کەوانە، دەبێت بیزانین ئەم فەرموودەیە هەڕەشەیەکی گەورەی تێدایە بۆمان چونکە ئەو باوەڕەی لەناو دڵە دەبێت لەسەر ئەندامەکانی لاشە دەرکەوێت بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەی

[١] - أبو داود ژمارەی فەرموودە: ٤٨٨٠

باوەڕەکەی ناو دڵەوە، و دەبێت بزانی چی بکەی خوای گەورە ئەوەت بەسەر دەینێت بەبێ ئەوەی ئاگاشت لێ هەبێت چونکە ئەم گەردونە فراوانە خاوەن و بەڕێوبەرێکی دادوەری هەیە، واتە، هەر شتێک ئەنجام بدەیت قەرزە، قەرزیش دەبێت بیدەیەوە، هەر وەکو لە پێغەمبەری مەزنەوە گێڕدراوەتەوە(ﷺ): **﴿من يتْبَعْ عورةَ أخيه المسلمِ يتبَعِ اللهُ عورتَه ومن يتبَعِ اللهُ عورتَه يفضَحْه و لو في جوفِ رحله﴾**[١] واتە: هەر کەسێک بەدوایی کەم و کوری برا موسوڵمانەکەی بکەوێت خوای گەورە حەیای دەبات ئەگەر لە ناو خانوەکەشی بێت.

بۆیە چی ئەنجام بدەی دێتەوە ڕێگات، ئاگاداربن ڕەحمەتی خواتان لێ بێت با بە دوای عەیب و عاری خەڵک نەکەوین و کەم و کوریان ئاشکرا نەکەین چونکە هەر کەسێک خوای گەورە بیەوێت عەیب و عاری ئاشکرا بکات بێگومان ریسوای دەکات و حەیای دەبات ئەگەر لە ناو ماڵەکەی خۆیشی دابێت، خۆشەویستەکەم ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی باوەڕ هێنان تەنها بە زوبان نیە بەڵکو دەبێت بە باوەڕکەت بسەلمێنێ و لە کردارەکانت ڕەنگ بداتەوە لەگەڵ ئەمەش دەبێت خۆت لە ئازاردانی موسوڵمانان بەدوور بگریت ئەوجا هەر ئازارێک بێت چی بە گوفتار و چی بە کردار، چونکە جارێکیان لە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) باسی چاکەی ئافرەتێک کرا بەڵام بە گوفتار و زوبانی ئازاری

[١] - سنن الترمذي ژمارەی فەرموودە: ٢٠٣٢

دراوسێیەکانی ئەدا، بۆیە پێغەمبەری سەروەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: **﴿هِيَ فِي النَّارِ﴾**[1] واتە: ئەو لە دۆزەخە.

ئەوجا باسی ئافرەتێکی تر کرا و گوتیان نوێژ و ڕۆژوی کەمە و زۆر نیە بەڵام بە زوبانی ئازاری دراوسێیەکانی نادات پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾فەرمووی: **﴿هِيَ فِي الْجَنَّةِ﴾**[2] واتە: ئەو لە بەهەشتدایە.

کەواتە، باخۆمان بپارێزین لە ئازار دانی موسوڵمانان چونکە، خوای گەورە هەڕەشە لەو کەسانە دەکات کە دەبێنە هۆی ئازاردانی موسوڵمانان هەر وەکو فەرمویەتی: **﴿وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُّبِينًا﴾**[3]واتە: ئەوانەی ئازاری باوەڕداران لە پیاوان یاخود لە ئافرەتان ئەدەن بە بێ ئەوەی هیچان کردبێت بێگومان ئەوانە درۆ و بوختان و گوناهی ئاشکرایان هەڵگرتووە.

تەنانەت بڕوادار نابێت پێشی خۆش بێت کە لە ناو کۆمەڵگای باوەڕداران خراپە و ناخۆشی ڕووبدات چ جای بە خۆی بیکات، هەر وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: لە قورئانی پیرۆزدا **﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾**[4] واتە:

---

[1] - أحمد ٩٦٧٥
[2] - أحمد ٩٦٧٥
[3] - الأحزاب ٥٨
[4] - النور ١٩

بەڕاستی ئەوانەی پێیان خۆشە کاری نادروست و ناڕەوا لە نێو باوەڕداران بڵاو ببێتەوە بە ڕاستی سزا و عەزابێکی بە ئازاریان بۆ هەیە لە دونیا و لە دوا ڕۆژدا چونکە خوای گەورە دەزانێت و ئێوە نازانن.

کەواتە دەبێت بزانین زۆر ترسناکە بە زوبان بڵێین باوەڕدارین و کردەوەشمان کردەوەی بڕواداران نەبێت چونکە ئەمە دەبێتە هۆی توڕەبونی خوای گەورە هەروەکو لە قورئانی پیرۆز خوای باڵا دەست فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ .... كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾[1] واتە: ئەی ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بۆ شتێک دەڵێن بەڵام کرداری پێ ناکەن چونکە خوای گەورە زۆر توڕە دەبێت لەو شتەی دەیڵێن و ناشیکەنە کردار.

کەواتە، با ئامۆژگاری نەفسی خۆمان بکەین لە پێش هەموو کەسێک ئەوجا ماڵ و منداڵمان، هەر وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾[2] واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! خۆتان وژن و منداڵتان بپارێزن لە ئاگرێک کە سووتەمەنییەکەی جەستەو لاشەی مرۆڤی کافرو بەردە.

خوای گەورە موەفقمان بکات بۆ جێبە جێکردنی تێکڕای ئیسلام بە گفتارو بە کردار ئامین.

---

[1] - الصف ٢-٣

[2] - التحريم ٦

# فەرموودەی (٢٦)

## شوێنکەوتنی سوننەت و دورکەوتنەوە لە بیدعە

﴿عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضي الله عنه)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ قَالَ: مَا مِنْ نَبِيٍّ بَعَثَهُ اللَّهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي إِلَّا كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ وَأَصْحَابٌ يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِهِ ثُمَّ إِنَّهَاتَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَالاَيَفْعَلُونَ وَيَفْعَلُونَ مَا لاَ يُؤْمَرُونَ فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الْإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ﴾[١] واتە: لە هاوەڵی بەڕێزەوە عبداللَّهی کوڕی مسعود (ڕەزای خوای گەورەی لێ بێت) لە پێغەمبەری گەورەوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێت بۆ ئوممەتێکی پێش منەوە چاندەها هاوەڵ و هاوڕێی هەبووە دەست گرتو بونە بە ڕێگا و ڕێبازەکەی و شوێن کەوتەی فەرمانەکانی بوونە ئەوجا لەدوای ئەوانەوە خەڵکانێک هاتوونە قسەیان دەکرد و کاریان پێ نەدەکرد و ئەو شتەیان دەکرد کە فەرمانیان پێ نەکرابێت هەر کەسێک جەنگیان لە گەڵ بکات بە دەستی بڕواداره و هەر کەسێک جەنگیان لە گەڵ بکات بە زوبانی

---

[١] - مسلم ٥٠

بڕواداره و هەرکەسێک جەنگیان لە گەڵ بکات بە دڵی بڕواداره و لە دوای ئەمە هیچ پلەی باوەڕ نامێنێت.

**ڕوونکردنەوە:** بەڕێزان ئەم فەرموودەیە گەورەیی هاوەڵانمان بۆ دەردەخات و دەستگرتنیان بە ڕێبازی پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ واتە: چاکترین و دڵنیاترین ڕێباز شوێنکەوتنی هاوەڵانی پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ و (ڕەزای خوای گەورەیان لێ بێت) چونکە ئەوان تاکە کۆمەڵ بون قورئان لە ناویان دادەبەزی و شەریعەت بە زوبانی ئەوانەوە دامەزرا؛ کەواتە، ئەوان لە هەموو خەڵکی زاناتر و شارەزاتر بوونە لە ئیسلام و لە هەموو ئوممەتیش بە تەقواتربوونە چونکە پێغەمبەری پێشەوایان ﴿ﷺ﴾ لە ناو بوو هەر گومانێك هەبوایە بۆیانی ڕون دەکردەوە کەواتە، چەند دوور بکەوینەوە لە سەردەمی پێغەمبەری ئازیزەوە ﴿ﷺ﴾ ئەوەندە بیدعە و خورافیات زۆر دەبێت، هەر وەها ئەم فەرموودەیە ترسناکی بیدعە و بیدعەچیەکانمان بۆ دەردەخات هەر وەکو دەفەرموویت: لە دوای ئەوانەوە کەسانێک پەیدا دەبن ئەو شتانە ئەنجام ئەدەن کە فەرمانیان پێ نەکرابێت هەر وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا () الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا﴾[1] واتە: ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێیان بڵێ: ئایا پێتان ڕابگەیینم کێیە خەسارت مەنترین کەس ؟

---

[1] - الكهف ١٠٢- ١٠٤

ئەوانەن کە بە ئارەزوو و هەوای خۆیان کارو کردەوە دەکەن و واش دەزانن ئەوان لەسەر ڕێگای ڕاست و دوروستن، ئەم شتانەش ئەنجام دەدەن کە فەرمانیان نەکرابێت.

خۆشەویستان ئێمە لە دوا ڕۆژ پرسیارمان لێ ناکرێت لەو شتانەی فەرمانمان پێ نەکرابێت، بەلکو، دەبێت ئاگاداری پەرستشەکانمان بین بە بێ بەڵگە هیچ پەرستنێک ئەنجام نەدەین، چونکە هەموو پەرستنێک ڕێ پێ نەدراوە مەگەر فەرمانمان پێ کرابێت لەلایەن خوای باڵادەست یاخود لە ڕێگای پێغەمبەری سە روەرەوە ﴿ﷺ﴾ واتە: هەر کەسێک باسی دینی بۆ کردین داوای بەڵگەی لێ بکەین هەر وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿**فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ...بالبينات**﴾[1] واتە: پرسیار لە زانا و شارەزاکان بکەن لەو شتانەی کە نایزانن بەڵام بە بەڵگە.

کەواتە، باوەڕداری ڕاستەقینە هیچ شتێک ناکەت بە بێ بەڵگە بو ئەوەی لە کەسانی زەرەرمەند نەبێت، داوامان لە خوای باڵادەستە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و هاوەڵەکانی بژیین و بمرین وهەر لەسەر ئەو ڕێگایەش زیدومان بکاتەوە ئامین.

---

[1] - النحل ٤٣

# فەرموودەی (٢٧)

# سوودی باوەڕ

**﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) أَنَّ النَّبِيَّ ﴿ﷺ﴾ قَالَ: يُخرَجُ من النَّارِ مَن كَانَ في قَلبِهِ مِثقَالَ ذَرَّةٍ من ٱلإِيمَانِ) قَالَ أَبُوسَعِيدٍ فَمَنْ شَكَّ فَلْيَقْرَأْ { إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾**[1] واتە: لە هاوەڵی زۆر بەڕێزەوە ئەبو سەعیدی خودریەوە (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە پێغەمبەری سەروەرەوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: لە ئاگر دەردەكرێت ئەوەی بە ئەندازەی تۆسقالە زەڕەیەك باوەڕ لە دڵیدا هەبێت ئەوجا ئەبو سەعید فەرمووی: هەر كەسێكیش گومانی هەبێت با ئەم ئایەتە بخوێنێتەوە **﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾**واتە: خوای گەورە بە ئەندازەی تۆسقالە زەڕەیەك ستەم ناكات.

**ڕوونكردنەوە:** مرۆڤی باوەڕدار ئەگەر تاوانی واشی هەبێت كە بە هۆیەوە بخرێتە دۆزەخەوە بەڵام هەمیشەیی نابێت و لە دوای فەزڵی خوای گەورەوە بە هۆی باوەڕەكەیەوە دەردەهێندرێتە دەرەوە و دەچێتە بەهەشتەوە، وەكو خوای گەورە فەرموویەتی: **﴿رُّبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمِينَ﴾**[2]واتە: لەو كاتەی

---

[1] - الترمذي ٢٥٩٨

[2] - الحجر ٢

موەحیدەکان لە دۆزەخ دەردەچن بۆ بەهەشت کافر و بێ باوەڕەکان خۆزگە دەخوازن ئەوانیش باوەڕدار بونا.

ئەمەش گەورەیی دادگەری خوای گەورەمان بۆ دەردەخات چونکە مرۆڤ ئەگەر کەمێکیش باوەڕێ هەبوبێت دەبێت پاداشتەکەی وەربگرێت، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿الْيَوْمَ تُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾[1] واتە: لەم ڕۆژدا هەموو کەسێک بەروبومی کردەوەکانی وەردەگرێت ئەمڕۆ ستەم لە گەس ناکرێت بەڕاستی خوای گەورە خێرایە لە پاداش دانەوە.

کەواتە، خوای باڵا دەست دادوەرێکی بێ وێنەیە و ستەم لە هیچ کەسێک ناکات پاك و بێگەردی بۆ خوای گەردوون تەنانەت مرۆڤی بێ باوەڕیش پاداشتی کردەوەکانی وەردەگرێتەوە بەڵام لە دونیا پێغەمبەری سەروەر﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الْكَافِرَ إِذَا عَمِلَ حَسَنَةً أُطْعِمَ بِهَا طُعْمَةً مِنَ الدُّنْيَا، وَأَمَّا الْمُؤْمِنُ فَإِنَّ اللَّهَ يَدَّخِرُ لَهُ حَسَنَاتِهِ فِي الْآخِرَةِ، وَيُعْقِبُهُ رِزْقًا فِي الدُّنْيَا عَلَى طَاعَتِهِ﴾[2] واتە: بێ باوەڕ هەر کارێکی چاکە بکات پاداشتەکەی لە دونیا وەردەگرێتەوە، وەکو خۆراک، بەڵام باوەڕدار خوای گەورە پاداشتی چاکەکانی لە دوا ڕۆژ دەداتە و لە گەڵ ڕزق و ڕۆزی لە دونیا وەدەگرێت لەسەر خوا پەرستیەکەی.

---

[1] - غافر ١٧

[2] - مسلم ٢٨٠٨

کەواتە، هیچ کەسێک ستەمی لێ ناکرێت چونکە خوای بێ هاوتا ستەمی لەسەر خۆی حەرام کردوە، بەڵام هەر مرۆڤە ستەم لە خۆی دەکات بە هۆی کار و کردەوە چەوتەکانیەوە خۆی توشی سزا و عەزابی خوای گەورە دەکات چونکە مرۆڤ ستەمکار و نەزانە، هەر وەکو خوای گەورە دەربارەی ئینسان دەفەرموێت: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَ الْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾[1] واتە: بەڕاستیی ئێمە سپاردەمان (ئەرکەکانی پەرستن) نمایشی ئاسمانەکان و زەویی و کێوەکان کرد کەچی هیچیان لە خۆیان ڕانەدیی ولە هەڵگرتنیان نکوڵییانکرد ونە چوونە ژێریی و ترسان کە نەتوانن هەڵسن بە جێبەجێکردنی داخوازییەکان، کەچی مرۆڤ هاتە پێشەوەو چووە ژێرباریی و هەڵیگرت چونکە مرۆڤ دوو سیفەتی نەفسی هەیە یەکەمیان جاهیل و نەزانە بەسەر ئەنجامی خۆی و دووەمیشیان ستەمکارە چونکە خۆی شایەنی عەزاب و تووڕەیی خوای باڵادەست دەکات.

واتە: جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای گەورە ئەوەندە قورسە ئاسمان و زەویی و شاخەکان لەگەڵ ئەو هەموو توانایەدا بۆیان هەڵنەگیرا بەڵام ئێمەی مرۆڤ خۆمان خستە ژێر ئەو بارە قورسەوە کەواتە، مادەم ئێمەی مرۆڤ ئەو بارەمان هەڵگرت با چۆن خوای گەورە پێی خۆشە ئاوا بیگەیەنین نەک چۆن نەفسی ئێمە پێی خۆش بێت چونکە مرۆڤ ڕاستە ڕێ نابێت مەگەر نیگا و وەحی

[1] - الأحزاب ٧٢

خوایی پاڵپشتی لێ بکات، ئەمەش لە ئوممەتی ئێمە تەنها وەحی بۆ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەکرێت کەواتە، ئەوەی بیەوێت سەرکەوتوی دونیا و دوا ڕۆژ بێت با شوێن کەوتەی پێغەمبەری خوا بێت ﴿ﷺ﴾ داوامان لە خوای مێهرەبانە پاڵ پشتیمان لێ بکات بۆ ئەوەی بە جوانترین شێوە ئەمانەتەکەی جێبەجێ بکەین ئامین.

# فەرموودەی (٢٨)

## حەیا و باوەڕ بەیەکەوە بەستراون

**﴿عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما) عن رسول الله ﴿ﷺ﴾ إنَّ الحياءَ و الإيمانَ قُرِنا جَميعًا فإذا رُفِعَ أحدُهما رُفِعَ الآخَرُ﴾**[١] واتە: لە عبداللّٰەی کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەری خۆشەویسەوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: بەڕاستی حەیا و باوەڕ بەیەکەوە بەستراوەتوە ئەگەر یەکێکیان نەما ئەوەی تریش نامێنێت.

**ڕوونکردنەوە:** بەڕێزەکانم بەڕاستی جێگای داخە هەندێک جار شتەکانمان لێ تێکەڵ دەکرێت، با لە سەرەتادا بزانین حەیا واتە چی؟

خۆشەویستانم با حەیا لەگەڵ شەرم تیکەڵ نەکەین چونکە، شەرم سیفەتێکی نەقس و لاوازیە بۆ مرۆڤ چونکە شەرم وا لە خاوەنەکەی دەکات بە هۆیەوە هەندێک لە مافەکانی خۆی لە دەست دەدات، بەڵام حەیا ئەوپەڕی ڕەوشت جوانیە، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: **﴿الْحَيَاءُ خَيْرٌ كُلُّهُ﴾**[٢] واتە: حەیا هەر هەمووی خێرە.

---

[١] - صحيح الجامع/ ١٦٠٣

[٢] - مسلم ٣٧

کەواتە، حەیا لە مرۆڤی موسوڵمان جیا نابێتەوە بە بەردەوام لەگەڵیەتی بۆ ئەوەی دووری بخاتەوە لە هەموو سیفەتێکی ناپەسەند و چەوت، حەیا لە هەموو یاساکان بەهێزترە چونکە بە ئاشکرا و بە پەنهان دەبێتە ڕێگر لە سەرپێچی و خراپە.

کەواتە، دەبێت حەیامان هەبێت بەتایبەتی حەیا کردن لە خوای گەورە، چونکە خوای باڵادەست باسی هەندێک لە سیفاتی نیفاق و دووڕوییان بۆ دەکات و دەفەرموێت: ﴿يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ﴾[1] واتە: ئەو دووڕووانە تاوان لە خەڵکی ئەشارنەوە و شەرم دەکەن لێیان کەچی لەو خوایە گەورەیە شەرم ناکەن لەگەڵ ئەوەی هەموو کاتێ خوای گەورە لە گەڵیانە و ئاگاداری کردار و گوفتاریانە.

کەواتە، واجبە حەیا لە خوای گەورە بکرێت حەیا کردنیش لە خوای بێ هاوتا واتە، بەرز ڕاگرتن و بەشکۆ زانینی فەرمانەکانی و ترسان لێی چونکە، ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ﴾[2] واتە: بۆ ئەو کەسەی لە وەستانی بەردەمی پەروەردگاری بترسێ بۆی هەیە دوو باخی خۆش.

کەواتە، هەر کەسێک خاوەن حەیا نەبوو نێزیکە بێ باوەڕیش بێت و هەر کەسێکیش پۆشاکی حەیا بپۆشێت باوەڕدارە و کەسیش عەیب وعاری نابینێت،

---

[1] - النساء ١٠٨

[2] - الرحمن ٤٦

چونکە پێغەمبەری پێشەوا ﴿ﷺ﴾ حەیا و باوەڕی بەیەکەوە بەستۆتەوە، حەیا چەند پێویستبێت بۆ پیاو ئەوەندە و زیاتریش پێویستە بۆ ئافرەت، بزانە خوای باڵا دەست بۆمان باسی چیرۆکی کچەکەی بەندە ساڵحەکە (شعیب) دەکات لەو کاتەی دێتە خزمەتی پێغەمبەر موسا (عليه السلام) هەروەکو دەفەرموویت: ﴿فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ قَالَتْ﴾[1]واتە: یەکیك لەکچەکان هات خزمەتی موسا (عليه السلام) بە شەرمەوە دەڕۆیشت و گوتی .

بەڵام وشەی ﴿اسْتِحْيَاءٍ﴾ دەتوانین لەگەڵ ﴿تَمْشِي﴾ بخوێنینەوە و بڵێین ﴿تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ﴾ واتە: بەحەیاوە دەڕۆیشت.

هەروەها و دەتوانین لەگەڵ ﴿قَالَتْ﴾ بخوێنینەوە، و بڵێین، ﴿عَلَى اسْتِحْيَاءٍ قَالَتْ﴾ واتە: بەحەیاوە فەرمووی.

کەواتە، بەحەیاوە دەڕۆیشت و بەحەیاشەوە قسەی دەکرد، و پێغەمبەری سەروەریشمان ﴿ﷺ﴾ لەسەر هەموو حەیاوە بووە چونکە ﴿كَانَ النَّبِيُّ ﴿ﷺ﴾ أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا﴾[2] واتە: پێغەمبەری پێشەوا ﴿ﷺ﴾ لەو کچانەی تازە پێڕادەگەن بە حەیاتربوە.

بەڵام، لە بیرمان نەچێت ئەوە پێی ناگوترێت حەیا کە واله مرۆڤ بکات پرسیاری شتی پێویست لە دینی خۆی نەکات، وەکو ئەحکامی جەنابەت و لەش گرانی

[1] - القصص ٢٥
[2] - البخاري/ ٣٥٦٢

یاخود نیکاح و مەنی و ئەو شتانە، چونکە ئەوە شەرمە نەک حەیا هەروەکو گوتمان شەرم سیفەتێکی نەقس و کەماتیە، بەڵام حەیا ئەو پەڕی ئەدەبە، واتە، خاوەن حەیا زۆر ئاگاداری هەڵسو کەوتەکانی خۆی دەبێت بۆ ئەوەی توشی شتێک نەبێت بە هۆیەوە عەیبدار و لەکەدار بێت یاخود زەم بکرێت.

بۆیە هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی واجبەکان و فەرزەکانی و دوور دەکەوێتەوە لە هەموو حەرام و قەدەغەکراوەکان کەواتە، حەیا جوانی و ڕازاندەوەی هەموو کار و کردەوەیەکە، هەر وەکو لە سەروەرمان گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی: ﴿وَلَا كَانَ الْحَيَاءُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا زَانَهُ﴾[1] واتە: حەیا لە هەر شتێک دابێت جوانی دەکات.

بەڵام، پێغەمبەری دڵسۆز ﴿ﷺ﴾ فێرمان دەکات و بۆمان ڕووندەکاتەوە چ حەیایەک بکەین کە شایەن و لایەقی خوای گەورە بێت وەکو دەفەرمووێت: ﴿اسْتَحْيُوا مِنَ اللَّهِ حَقَّ الْحَيَاءِ قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَسْتَحْيِي وَالْحَمْدُ لِلَّهِ قَالَ: لَيْسَ ذَاكَ وَلَكِنَّ الِاسْتِحْيَاءَ مِنَ اللَّهِ حَقَّ الْحَيَاءِ، أَنْ تَحْفَظَ الرَّأْسَ وَمَا وَعَى وَالْبَطْنَ وَمَا حَوَى وَتَتَذَكَّرَ الْمَوْتَ وَالْبِلَى، وَمَنْ أَرَادَ الْآخِرَةَ تَرَكَ زِينَةَ الدُّنْيَا، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدِ اسْتَحْيَا مِنَ اللَّهِ حَقَّ الْحَيَاءِ﴾[2] واتە: حەیاتان هەبێت لە بەرامبەر خوای گەورە، هاوەڵان فەرموویان: ئێمە حەیامان هەیە الحمد للّٰه پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

---

[1] - إبن ماجه ٤١٨٥

[2] - الترمذي ٢٤٥٨

فەرمووی: مەبەستم ئەوە نیە بەڵکو ئەو حەیایەی مەبەستمە ئەوەیە کە سەرتان بپارێزن و ئەوەی لەناو سەرتاندایە، واتە، سەر دانەنوێنی بۆ غەیری خوای گەورە و سوجدە نەبەن بۆ ریاء و بۆ ناوبانگ و سەرتان بەرز نەکەنەوە بۆ گەورەیی و بۆ خۆ بەزل زانین، و ئەوەی لەناو سەرتاندایە واتە، زوبان و بینین و بیستنتان بۆ تاوان بەکاری نەهێنن، هەروەها سگتان بپارێزن لە خواردنی حەرام و ئەوەی لە دەورو بەری سگتاندا بپارێزین، واتە، دڵتان لە گومانی خراپ و نیفاق و حەسوودی بپارێزن، هەروەها دەست و قاچەکانتان بۆ چاکە نەبێت بە کاری نەهێنن و داوێنتان بۆ حەڵاڵ نەبێت بەکاری نەهێنن و زۆر یادی مردن و ڕزینی لاشەتان لە ناو گۆڕ بکەنەوە و هەر کەسێک دوا ڕۆژی بوێت دەبێت واز لە جوانی و خۆشیەکانی دونیا بهێنێت.

کەواتە، هەر کەسێک وابوو بەڕاستی ئەوە بەچاکی حەیای لە خوای گەورە کردوە، بەڕێزەکانم حەیا ئەوەندە گرنگە بۆیە بۆتە هاوتای باوەڕە، چونکە هەر کەسێک حەیای نەما ئەوە هەموو سنورەکانی دەبەزێنێت، هەروەکو خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ﴿إِذَا لَمْ تَسْتَحِي فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ﴾[١] واتە: ئەگەر حەیات نەما هەموو شتێکت لە دەست دێت.

چونکە گەیشتوەتە لوتکەی خراپە، داواکارین لە خالقی بە سۆزەوە عاقیبەتمان خێر بکات و جێگامان بکاتە فیردەوسی بەرز ئامین.

[١] - البخاري ٣٤٨٤

# فەرموودەی (٢٩)

# لە دەستدانی باوەڕ بە ئاسانی

﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ قَالَ: بَادِرُوا بِالْأَعْمَالِ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ، يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤْمِنًا، وَيُمْسِي كَافِرًا و يُمْسِي مُؤْمِنًا، وَيُصْبِحُ كَافِرًا يَبِيعُ دِينَهُ بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنْيَا﴾[١] واتە: لە هاوەڵی بەڕێزەوە ئەبو هورەیراوە (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە خۆشەویستی گەورەوە ﴿ﷺ﴾ کە فەرموویەتی: پەڵە بکەن بۆ ئەنجامدانی چاکە پێشی ئەوەی فیتنە و بەڵای واتان بەسەردا بێت وەکو پارچە شەوی تاریک مرۆڤ بەیانی دەکاتەوە باوەڕدارە بەڵام پێش ئەوەی ئێوارە بکاتەوە باوەڕەکەی لە دەست دەدات یاخود ئێوارە باوەڕدارە و بەیانی دەکاتەوە باوەڕەکەی لەدەست دەدات ئاینەکەی خۆی دەگۆڕێتەوە بە بەشێکی کەم لە خۆشیەکانی دونیا.

**ڕوونکردنەوە:** کەواتە، فیتنەمان وا لەپێشە ئەگەر فیتنە هات پێش ئەوەی کردەوەی چاک بکەین دوایی پێمان ناکرێت چونکە فیتنەکە دەبێتە ڕێگر لێمان بەڵام ئەگەر دەستمان بەکاری چاک کرد پێش هاتنی فیتنە بەئیزنی خوای گەورە بۆمان دەبێتە پەنا لەو فیتنانەی بەسەر خەڵکدا دێت، باسی بەیانی و ئێوارە

---

[١] ـ مسلم ١١٨

کراوە وەکو نموونە چونکە کەسی وا هەیە لە نێوان نیوەڕۆ و عەسر باوەڕەکەی لە دەست دەدات چونکە بەرگەی فیتنە ناگرێت پەنا بەخوا، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّـهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّـهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّـهِ﴾[1] واتە: لە ناو مرۆڤەکان هێندێ خەڵک هەیە دەڵێت باوەڕمان بەخوا هەیە کەچی کاتێکیش لەسەر خوا ئازار درا سزا و ئازاری خەڵکی گێرا وەکو سزای خوای گەورە.

بۆیە، دوایش خۆی بۆ راناگیرێ و پاشگەز دەبێتەوە، کەواتە، خوا پەرستن هۆکارێکە بۆ دەرباز بوون لەفیتنە و ناخۆشی، ئەم فەرموودەیە ئاگادارمان دەکاتەوە لە فیتنەی کۆتا زەمان و کەم نرخی دونیامان بۆ دەر دەخات، نەوەک دوا ڕۆژی خۆمان بگۆڕینەوە بە کەمێکی دونیا، کەواتە باوەڕدار و موسوڵمانی وا پەیدا دەبێت باوەڕەکەی خۆی زۆر بە ئاسانی و بە نرخێکی کەم دەفرۆشێت تاوەکو وای لێدێت بەیانی باوەڕدارە بەڵام باوەڕەکەی ناگاتە ئێوارە و لەدەستی دەدات بۆ بەدەست هێنانی کەمێک لە خۆشیەکانی دونیا، دەبێت بزانین هەموو ئەوەی لەسەر زەویە بەدوای خۆشی و بەختەوەری دەگەرێت، بەڵام هەر کەسەو بەختەوەری لە شتێک دەبینێت ئەوجا کەسی وا هەیە وا دەزانێت هەموو بەختەوەری بە کۆکردنەوەی ماڵ و سامانە، بۆیە بەدوای کۆکردنەوەی سەرووەت و سامانە تامردن، کەسی واش هەیە وا دەزانێت بەختەوەری لە پلە و پایەیە،

---

[1] - العنكبوت ١٠

بۆیە بەدوای پلەو پایە کەوتوە، کەسی واش هەیە وا دەزانێت هەموو بەختەوەری لە بەدەست هێنانی بڕوانامە و شهادەی بەرزە، بەڵام ئەو شتانە هەر هەمووی خۆشی و بەختەوەری کاتین، بەڵام بەختەوەری ڕاستەقینە لە ڕەزامەندی خوای باڵا دەستە، هەر وەکو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ اللَّهِ بَاقٍ﴾[1] واتە: ئەوەی لای ئێوەیە و بە ئێوە بەخشراوە، کاتین و تەواو دەبێت، بەڵام ئەوەی لای خوایەو (لە پێناوی ئەودا ئەنجامی ئەدەن) دەمێنێتەوە بۆ هەمیشە.

بەڵام با بزانین کامە خۆشی ژیانی ڕاستەقینەیە، کە خوای گەورە بۆمانی ڕوون کردوتەوە و فەرموویەتی: ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً﴾[2] واتە: هەر کەسێک لە نێر یان لە مێ هەر کارێکی چاکە ئەنجامبدا و باوەڕداریش بێت بەڵێن بێت بە خۆش ترین ژیان بیژێنین.

هاوەڵی ئازیز موفەسیری قورئان ئیبن عەباس (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرمووێت: ﴿حَيَاةً طَيِّبَةً﴾ خۆشییەکە دەخرێتە دڵی بەندە ساڵیحەکان ئەگەر لە ناخۆشترین ژیانیش بن.

إبن القيم (رحمه‌الله) فەرموویەتی: (ئەگەر توشی دڵ تەنگی و نارحەتی بوباین دەچوینە خزمەتی شێخی ئیسلام ئیبن تیمیة لەگەڵ ئەوەی کە لە ناخۆشترین

[1] - النحل ٩٦
[2] - النحل ٩٧

ژیانیش بوو لە دونیا، بەڵام کە گوێیان لە قسەکانی دەبوو هەموو ناخۆشیەکانمان لە بیر دەچوو، چونکە دەیفەرموو: **﴿إن في الدنيا لجنَّة من لم يدخلها لم يدخل جنة الآخرة﴾**[1] واتە: لە دونیا بەهەشتێک هەیە هەر کەسێک نەچێتە ناویەوە ناچێتە بەهەشتی قیامەت.

شێخ مەبەستی لە بەهەشتەکە؟ باوەڕە هەر بۆیەش ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم دەیفەرموو: ئەگەر پادشاکان بیان زانیبایا ئێمە لە چ خۆشیەکین بە شمشێر لێیان وەردەگرتین: پاک و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی بەهەشتی خۆی بەبەندە ڕاستەقینەکانی خۆی بەخشیوە پێشی بچنە ناوی لە باسی بەندە چاکەکانی خۆی هەر وەکو فەرموویەتی: **﴿وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ﴾**[2] واتە: دەیانباتە ئەو بەهەشتەی کە بە هەموو جۆر و شێوەیەکەوە بۆی باسکردوونە.

وادەزانن یەکەم جار نیە دەچنە ناوی چونکە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ سوێند دەخوات و دەفەرموێت: **﴿لَأَحَدُهُمْ بِمَسْكَنِهِ فِي الْجَنَّةِ أَدَلُّ بِمَنْزِلِهِ كَانَ فِي الدُّنْيَا﴾**[3] واتە: ئەوانەی دەچنە بەهەشتەوە ڕێگای ماڵەکانیان لە بەهەشت دەزانن زۆر چاکتر لە ڕێگای ماڵەکانیان لە دونیادا.

کەواتە، خۆشەویستانم با هەوڵبدەین پێش مردنمان پێ بگات با ئاگاداری بیروباوەڕمان بین بەئاسانی لە دەستی نەدەین بۆ شتێکی کەمی دونیا چونکە

---

[1] - الوابل الصيب من الكلام الطيب/٨٢

[2] - محمد ٦

[3] - البخاري/٢٤٤٠

دونیا هەر هەمووی خۆشیەکانی کاتی و کەمە ئەگەر بەراودی بکەین بە خۆشی بەهەشت بزانە؛ خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ دەفەرموویت: ﴿مَوْضِعُ سَوْطِ أَحَدِكُمْ مِنَ الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا﴾[1] واتە: جێگای گۆچانەکەی یەکێکتان لە بەهەشت چاکترە لە هەموو دونیا و ئەوەی لەناو دونیادایە.

باشە ئێمە چیمان هەیە ئەگەر بەراوردی بکەین بە هەموو دونیا، ئەگەر هەموو دونیاشت هەبێت ناکاتە جێگای گۆچانەکەمان لە بەهەشت.

کەواتە، با هەموو هەوڵمان بۆ بەهەشت بێت جونکە سەرکەوتوو ئەو کەسەیە بەهەشت بباتەوە دونیاش تەنها وەکو ڕێگا بەکار بێنێت بۆ بەدەست هێنانی بەهەشت، بابزانین سەروەرمان چۆن باسی دونیا دەکات هەر وەکو دەفەرموێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن أَسْلَمَ وَرُزِقَ كَفَافاً وَقَنَّعَهُ اللّهُ بما آتَاهُ﴾[2]واتە: ئەوەی موسوڵمان بوویێت و ڕزق و ڕۆزی بەشی خۆی پێی درابێت خوای گەورەش بەوەی پێیداوە قەناعەتی پێهێنا بێگومان ئەو کەسە سەرکەوتوو بووە.

بۆیە با کار و کردەوەیەکی وابکەین ئەو بەهەشتە خۆشە بەدەست بهێنین بە فەزڵ و منەتی خوای گەورە، داوامان لە خوای تعالی یە لەسەر ڕێگای حەق ڕاگیرمان بکا تا کۆتا هەناسە و بەلیقای خۆی شادمان بکا ئامین.

---

[1] - البخاري/٢٨٩٢

[2] - مسلم ١٠٥٤

## فەرمووده‌ی (٣٠)

## پلەکانی باوەڕ

**﴿عن أَبُو سَعِيد (رضي الله عنه): سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ﴾**[١] واتە: هاوەڵی بەڕێزەوە ئەبو سەعیدی خودریەوە (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) گوێن لە پێغەمبەری سەروەرەوە بو (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێک خراپەیەکی بینی با بەدەست بیگۆڕێت، ئەگەر هەر نەیتوانی بابەزوبان بیگۆڕێت، ئەگەر هەر نەیتوانی با بە دڵ پێ ناخۆش بێت ئەمەش کەمترینی پلەی باوەڕە.

**ڕوونکردنەوە:** کەواتە، باوەڕدار دەبێت هەموو ژیانی بۆ کردنی کاری چاکە بێت و گۆڕین و نەهێشتنی خراپە لە خۆی و لە کۆمەڵگاکەی، چونکە ئەم سیفاتە تەنها لە ڕەوشتی ئیسلامدایە، خۆشەویستان فەرمان کردن بە چاکە و ڕێکرتن لە خراپە گرنگترینی کاری موسوڵمانە، چونکە ئەمە کاری زانا و داناکان و ئەهلی عیلم و پێشەواکانە چونکە باشی و چاکی کۆمەڵگاکان بە هۆی ئەو ڕەوشتە جوانەوەیە، کە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری و قەدەغەکردنە لە خراپە، بۆیە چاکترینی ئوممەتەکان ئوممەتی (محمد)ە(ﷺ) لە بەر ئەو کارەییە بۆیەش خوا

---

[١] - مسلم/٤٩

سبحانه و تعالي یەک دەنگی ئوممەتی پاراستوە هەروەکو پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: ﴿إنّ الله لا يجمع أمّتي ضلالة﴾[1] واتە: خوای گەورە هەرگیز ئوممەتی من کۆناکاتەوە لە سەر گومڕایی.

ئەویش لە بەر فەرمانکردنە بە چاکە و ڕێگری کردنە لە خراپە بۆیەش خوای گەورە بە چاکترینی ئوممەتان وەسفی کردوونە هەروەکو فەرموویەتی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾[2] واتە: ئێوە چاکترین ئوممەتێکن بۆ خەڵک نێردراون بۆ ئەوەی فەرمان بە چاکە بکەن و ڕێگری لە خراپە بکەن.

﴿قال عمر بن الخطاب: لو شاء الله لقال: " أنتم " فكنا كلنا، ولكن قال: كُنتُمْ في خاصة من أصحاب رسول الله ﴿ﷺ﴾ ومن صنع مثل صنيعهم﴾[3]

واتە: پێشەوا عومەر (ڕەزای خوای تعالی لەسەر بێت) دەفەرمووێت: ئەگەر خوای گەورە فەرمووبایا: ﴿أنتم﴾ هەموومانی دەگرتەوە، بەڵام فەرمووی: ﴿كُنتُمْ﴾ واتە تەنها هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و هەر کەسێک کاری وەکو ئەوان بکات کە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپەیە.

هەروەکو پێغەمبەری مەزن ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: ﴿والذي نفسُ محمد بيده إن مَثَل المؤمن لكمَثَل النَّحلة أكلَتْ طيبًا ووضعَتْ طيبًا ووقعَتْ فلم تكسِرْ ولم

[1] - سنن الترمذی ٢١٦٧
[2] - آل عمران ١١٠
[3] - بروانە: تەفسیری تەبەری سورەتی ال عمران

**تُفسِدْ﴾**[1] واتە: سوێند بەو زاتە گیانی محمدی ﴿ﷺ﴾ بە دەستە نموونەی باوەڕدار وەکو هەنگ وایە پاک دەخۆت و پاکیش بەرهەم دێنێت و لەسەر هەر شتێکیش دابنیشێت نە دەیشکێنێت و نە تێکیشی دەدات.

کەواتە، باوەڕدار خەریکی چاکەیە بە گوێرەی توانای؛ بە دەست یاخود بە زوبان ئەگەر هەر نەکرا با بە دڵ ڕقمان لە خراپە بێت، واتە با کەمتەر خەم نەبین لە ئامۆژگاری بۆ چاکە کردن، بزانە پێغەمبەرەکەمان ﴿ﷺ﴾ هەموو دینی ئیسلامی کردوەتە ئامۆژگاری، هەروەکو فەرموویەتی: **﴿الدِّينُ النَّصِيحَةُ قُلْنَا لِمَنْ ؟ قَالَ لِلَّه وَ لِكِتَابِهِ وَ لِرَسُولِهِ وَ لِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَ عَامَّتِهِمْ ﴾**[2] بە ڕاستی ناتوانین ئەم فەرموودە شیرینە وەکو خۆی شیبکەینەوە چونکە هەمووی ئیسلامی کۆکردوتەوە بەڵام چەند خاڵێکی لێ باس دەکەین وەکو خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: ئاین بریتییە لە ئامۆژگاری: هاوەڵانی بەڕێز (ڕەزای خوای تعالی یان لێ بێت) فەرموویان: ئامۆژگاری بۆ کێ؟ خۆشەویست فەرمووی: بۆ خوای گەورە واتە، باوەڕ پێ هێنان و بە تاک ڕاگرتنی و بە گوێڕایڵی فەرمانەکانی و دور کەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکانی و خۆ لادان لە هەموو شیرک و هاوبەشێک، ئامۆژگاری بۆ کیتابەکە واتە، باوەڕ هێنان کە قورئان کەلامی خوای گەورەیە و دایبەزاندوە بۆ بەندە گەورەکەی کە محمدە ﴿ﷺ﴾ و خوێندنەوەی بە جوانترین شێوە بە

---

[1] - أحمد٦٨٧٢

[2] - مسلم ٥٥

تێگەیشتنەوە و جێبە جێ کردنی لە کاروباری ڕۆژانەی، ئامۆژگاری بۆ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بەوە دەبێت؛ باوەڕبون بە هەموو ئەوانەی باسی کردوە و جێبە جێ کردنی فەرمانەکانی و خۆ دوور خستنەوە لە هەموو ئەو شتانەی قەدەغەی کردوە و دەست گرتن بە سونئەتەکانی کە لەسەر و سیما و هەڵسوکەوتی باوەڕدار دەرکەوێت، ئامۆژگاری بۆ سەرکردەکانی موسوڵمانان بەوە دەبێت؛ هاوکاریان لەسەر خێر و چاکە و ئاگادار کردنەوەیان لە هەڵەکانیان هاوکاری نەکرتنیان لە زولم و ستەم، ئامۆژگاری بۆ تێکڕای موسوڵمانان بەوە دەبێت دەست گرتنیان بۆ ڕێگای ڕاست و ڕێگرتنیان لە خراپە و لادانی ئەزیەت و ناخۆشی لەسەریان و بەزیی پێ بردنیان و خۆ دوور خستنەوە لە هەموو ئازارێکیان چونکە (نصیحة)واتە: رزگار کردنی ئەو کەسەی ئامۆژکاری دەکەی لە ناخۆشیەکان: واتە دەبێت باوەڕداری ڕاستەقینە چاکەی بۆ هەموو کەسێک هەبێت و دەستیان بگرێت لە هەموو خراپەیەک.

داوامان لە خالقی گەورەیە لە دونیا بمانکاتە پێشەوا بۆ باوەڕداران و لە قیامەتیش پلەی شەهیدان و زانا ڕابەرەکانمان پێ ببەخشێت ئامین.

# فەرموودەی (٣١)
# ترسناکی ڕیا

﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (ﷺ) قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ، فَقَالَ: أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِمَا هُوَ أَخْوَفُ عَلَيْكُمْ عِنْدِي مِنَ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ؟ قَالَ قُلْنَا: بَلَى فَقَالَ{الشِّرْكُ الْخَفِيُّ أَنْ يَقُومَ الرَّجُلُ يُصَلِّي فَيُزَيِّنُ صَلَاتَهُ لِمَا يَرَى مِنْ نَظَرِ رَجُلٍ﴾[1] واتە: لە ئەبو سەعیدی خودری(ڕەزای خوای گەورەی لێ بێت) ڕۆژێک خۆشەویستی خوا ﴿ﷺ﴾ لێمان دەرکەوت ئێمە باسی دەجالمان دەکرد پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئایا شتێکتان پێ بڵێم کە لە دەجال ترسناکترە لای من لەسەرتان؟ فەرموویان بەڵێ فەرمووی: شیرکی شاراوە کەسێک هەڵدەستێت نوێژ دەکات بە ڵام نوێژەکەی لە بەر خەڵک دەڕازێنێتەوە .

**ڕوونکردنەوە:** کەواتە، دەبێت زۆر ئاگاداری دڵەکانمان بین نەوەک مەبەستێک بچێتە ناو دڵمان بۆ جگە لە خوای گەورە، دەبێت بیزانین کردار تەنها یەک پاداشتی لەسەر وەر دەگیرێت یان مەدح و سەنای خەڵک یان ڕەزامەندی خوای گەورە، هەر وەکو پێغەمبەری شکۆمەند ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: ﴿بَشِّرْ هَذِهِ

[1] - إبن ماجه/٤٢٠٤

الْأُمَّةَ بِالسَّنَاءِ، وَالرِّفْعَةِ، وَالنَّصْرِ، وَالتَّمْكِينِ فِي الْأَرْضِ، فَمَنْ عَمِلَ مِنْهُمْ عَمَلَ الْآخِرَةِ لِلدُّنْيَا، لَمْ يَكُنْ لَهُ فِي الْآخِرَةِ نَصِيبٌ﴾[1] واتە: مژدە بدەنە ئەو ئوممەتە (ئوممەتی گوێڕایەل) بە بەرزی و شکۆمەندی و سەرکەوتوویی و زاڵ بوون بەسەر خەڵکانی تر بەڵام هەر کەسێک کردەوەیەکی قیامەتی بکات بۆ مەبەستێکی دونیای ئەوا هیچ شتێکی بۆ نیە لە دوا ڕۆژ.

چونکە، کارکردن بۆ ژیانی دونیا بۆ ماڵێکی حەلاڵ ڕێگە پێدراوە تاوەکو بە سەر بەرزی بژین و چاومان لە دەستی کەس نەبێت، بەڵام دونیا کرداری خۆی هەیە، خۆشەویستانم بەندایەتی زۆر گەورەیە جێگای داخە موسوڵمان بە نرخێکی کەم ڕازی بێت لە بەرامبەر خوا پەرستیەکەی، چونکە عیبادەت و پەرستن تەنها لەپێناو ڕەزامەندی خوای گەورە و بەهەشت دەکرێت، کەواتە خوای گەورە بە هیچ شێوەیەک ڕێگری لێ نەکردوینە بۆ دونیا هەوڵبدەن، بەڵام دەفەرموێت: کردەوەی چاکە تێکەڵی شیرک نەکەن چونکە بە هیچ شێوەیەک قبول ناکرێت، خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسی دەفەرموێت: ﴿أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلًا أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ﴾[2] واتە: خوای (جل جلاله) دەفەرموێت: من دەوڵەمەندترینی شەریکەکانم هەر کەسێک

---

[1] - أحمد ٢١٢٢٢

[2] - مسلم ٢٩٨٥

کردەوەیەکی ئەنجام دا بۆمن و کەسێکی تری کردە هاوبەش لە گەڵم واز لە خۆی و هاوبەشەکەشی دێنم.

هەر بۆیە پێغەمبەری سەرووەریش ﴿ﷺ﴾ زۆر ئوممەتەکەی خۆی ئاگادار کردۆتەوە لە هەر کارێک کە ببێتە هۆی پوچەڵکردنی کاروکردەوەی چاکە بەتایبەت شیرک. ئینجا ڕوپامایش (ریاء) شیرکە، هاوەڵان باسی ترسناکی دەجالیان دەکرد بەڵام پێغەمبەری پێشەوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەوەی لە دەجال ترسناکترە ریایە، کەواتە، ئەگەر کردەوەکانمان بۆ خوای گەورە نەبێت نەک وەرناگیرێت بەڵکو لەسەری قەرداریش دەبینەوە چونکە شیرکە، شیرکیش گەورەترین تاوانەکانە، پرسیار لە پێغەمبەری سەروەر﴿ﷺ﴾ کرا، ﴿**الرَّجُلُ يُقَاتِلُ حَمِيَّةً، وَيُقَاتِلُ شَجَاعَةً، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً، فَأَيُّ ذَلِكَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ؟ قَالَ: مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا، فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ**﴾[1] واتە: ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کەسی وا هەیە دەجەنگێت لە پێناو خزم و کەسوکاری؟ کەسی واش هەیە دەجەنگێت بۆ ئازایی؟ کەسی واش هەیە تەنها بۆ ریاء دەجەنگێت؟ کامەیان لە پێناو خوای گەورەیە؟ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: هەر کەسێك بجەنگێت بۆ ئەوەی وشەی لاإلە إلااللّه بەرز ڕابگیرێت تەنها ئەوە لە پێناو خوای گەورە یە.

---

[1] - البخاري/٧٤٥٨

کەواتە، برایان با خۆمان یەک لا بکەینەوە و کارو کرداری دونیا تەنها بۆ دونیا ئەنجام بدەین، و ئەنجام دانی پەرستن و عیبادەت تەنها بۆ ئەو زاتە بێت کە تەنها ئەو شایەنی پەرستنە، چونکە خوای بێ هاوتا زۆر بێ نیازە لەپەرستنی بەندەکانی، چونکە زۆر دەوڵەمەند و باڵادەستە بابزانین ژمارەی بەندەکانی خوای باڵادەست چەندن؟ پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەربارەی (بیت المعمور) کە لە ئاسمانی حەوتەمە دەفەرموێت: ﴿يُصَلِّي فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ، إِذَا خَرَجُوا لَمْ يَعُودُوا إِلَيْهِ﴾[1] واتە: هەموو ڕۆژێک حەفتا هەزار فریشتە نوێژی لێ دەکەن و نۆرەیان پێ ناگاتەوە تاوەکو ڕۆژی دوای.

کەواتە خوای گەورە کارێک وەرناگرێت تەنها بۆ خۆی نەبێت هەر وەکو پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبَلُ مِنَ الْعَمَلِ إِلَّا مَا كَانَ لَهُ خَالِصًا، وَابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُهُ﴾[2] واتە: خوای گەورە هیچ کردەوەیەک قبول ناکات ئەوەی بە دڵسۆزی نەبێت و تەنها مەبەستیشی لێ ڕەزامەندی خۆی بێت.

بۆیە دەڵێین یارەبی خوایە تەوفیقمان بدەی بۆ ئەوەی هەموو کار وکردەوەکانمان تەنها و تەنها بە ئیخلاسی و دڵسۆزی بۆ تۆبێت ئامین.

---

[1] - بوخاری ٣٢٠٧

[2] - النسائی ٣١٤٠

## فەرموودەی (٣٢)
## تێکەڵ بوونی خەڵك

**﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ الْمُؤْمِنُ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ، وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنَ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لاَ يُخَالِطُ النَّاسَ، وَلاَ يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ﴾**[١] واتە: لە عبداللّٰەی کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوا تعالی لێ بێت) لە خۆشەویستی خواوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ئەو باوەڕدارەی تێکەڵی خەڵک دەبێت و سەبر و ئارام دەگرێت لەسەر ئازارکانیان پاداشتی گەورە تر و زۆرترە لەو باوەڕدارەی کە تێکەڵی خەڵک نابێت و ئارامی لەسەر ئازار و نارحەتیەکانیان ناگرێت.

**ڕوونکردنەوە:** ئەم فەرموودە هانمان دەدات تێکەڵی خەڵک ببین بۆ ئەوەی ئاگاداری بارودۆخی باوەڕداران بین و بانگەوازیان بکەین بۆ ڕێگا ڕاستەکەی ئیسلام، بەڵام ئەگەر کەسێک لاواز بێت و خۆ ڕاگر نەبێت، با خۆی بە دور بگرێت، ئەوە بۆی چاکترە، بۆ ئەوەی باوەڕەکەی پارێزراو بێت، چونکە باوەڕداری پاک دەبێت هەوڵبدات دەورر و بەریشی پاک بکاتەوە، کەواتە دەبێت باوەڕدار تێکەڵی خەڵک بێت و لێیان نزیک ببێتەوە و بەهێز بێت بۆ ئەوەی

[١] - ابن ماجه/٤٠٣٢

بتوانێت بانگیان بکات بۆ ڕێگای ئیسلام، ئەگەر بیەوێت پلە بەرزەکەی ئیسلام بەدەست بهێنێت وەکو پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ﴿الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ﴾[1] واتە: باوەڕداری بەهێز چاکتر و خۆشەویسترە لای خوای گەورە لە باوەڕداری لاواز و هەردوکیان خێریان پێوەیە.

کەواتە باوەڕدار دەبێت بەهێز بێت نەک خۆ پەرێزبێت و لە شوێنێک خۆی حەشار بدات و بەتەنیا خوا پەرستی ئەنجام بدات یاخود وەکو دەڵێن کڵاوی خۆت بگرە با بانەیبات ئەم جۆرە قسانە هی گاورەکان و ڕەهبانەکانە سیفەتی موسوڵمانان وانیە چونکە پێغەمبەری سەروەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الرَّهْبَانِيَّةَ لَمْ تُكْتَبْ عَلَيْنَا﴾[2] واتە: ڕەهبانیەت و گۆشەگیری لەسەر ئێمە نەنوسراوە، واتە، لە ئیسلامدا نیە.

بەداخەوە ئەمڕۆ زۆرێک لە موسوڵمانان بەهەڵە لەم ئایەتە تێگەیشتونە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾[3] واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هۆشتان بە خۆتانەوە بێت زیانتان پێ ناگەیەنێت ئەوەی گومڕا بووە ئەگەر ئێوە لەسەر ڕێی ڕاست بن.

---

[1] - مسلم ٢٦٦٤

[2] - أحمد ٢٥٨٩٣

[3] - المائدة ١٠٥

بەڵام بابزانین سەلەفی ئەم ئۆممەتە چۆن لەم ئایەتە تێگەیشتون؟ **﴿عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: قَامَ أَبُو بَكْرٍ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ هَذِهِ الْآيَةَ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لَايَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾ وإنكم تضعونها على غيرموضعها وَإِنَّا سَمِعْنَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ﴿إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوُا الْمُنْكَرَ لَا يُغَيِّرُونَهُ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللَّهُ بِعِقَابِهِ﴾**[1] واتە: لە قەسی کوڕی باوکی حازمەوە دەفەرمووێت: جارێک ئەبوبەکر (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) هەستاو فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێنەوە بەڵام لە شوێنی خۆی دانانێن (واتە وەکو خۆی تێناگەن) چونکە ئێمە لە پێغەمبەری خوامان (ﷺ) بیست دەیفەرموو: (ئەگەر خەڵک خراپەیان لە نێو خۆیان بینی و نەیان گۆڕی نزیکە خوای گەورە هەموویان بە تێکڕا توشی خەشمی خۆی بکات.

بزانە پێشەوا ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لەسەر بێت) دەیفەرموو: ئەوە کاری هەموو کەسێك نیە،

کەواتە، مەرج نیە هەر کەسێك قورئان خوێن بێت بتوانێت ئایەتی قورئان وەکو بەڵگە باس بکات لەسەر کار و کردەوەکانی، چونکە قورئان خوێندن شتێکە و دەرهێنانی حوکم لە قورئان شتێکی ترە، بۆیە، دەبێت بڕواداری چاک تێکەڵی خەڵک بێت و بۆ ئەوەی سوودی بۆیان هەبێت و بانگیان بکات بۆ لای خوای

[1] - ابن ماجه/٤٠٠

گەورە، بەڵام دەبێت بزانین بۆ بەرهەمداری ئەو کردارە ڕاستەقینەیە پێویستە کەسەکە ئەم چوار خاڵەی هەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت بە جوانی بانگەوازی بۆ ئیسلام بکات، ئەویش:

(١) عیلم و زانستێکی باشی هەبێ لە قورئان و سوننەت بۆ ئەوەی بتوانێت قەناعەت بە خەڵک بکات نەوەک بۆخۆی پێویستی بە ڕێنوێنی هەبێت.

(٢) کار کردن بە زانستەکەی چونکە قسە لە هیچ کەسێک وەرناگیرێت تاوەکو بۆ خۆی جێبەجێی نەکات.

(٣) بانگەوازی بۆ ئەو عیلم و زانستە بکات کە لەسەریەتی چونکە ئەگەر فێرە زانستێك ببین با ڕەزیل نەبین براکانمانی لێ بێبەش نەکەین بۆ ئەوەی ئەوانیش خۆشبەخت بین و ئێمەش پاداشت و ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەست بهێنین.

(٤) دەبێت سەبر و ئارامیان لەسەر هەبێت چونکە دەبێت لە بیرمان بێت و بیزانین هەر کەسێک عیلمی هەبێت و کار بە عیلمەکەی بکات و بانگەوازی بۆ تەوحید و ئەو ڕاستیە بکات بە بێگومان توشی ئەزیەت و ئازاری خەڵکانێک دەبێتەوە، چونکە گەیاندنی ئیسلام بەم شێوەیە بووە و هەر ئاواش دەبێت.

کەواتە، دەبێت بانگەوازکار سەبر و ئارام بگرێت.

بۆیە پێشەوا شافعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ئەگەر خوای گەورە تەنها سورەتی عەسری دابەزاندبایە بەس بوو، بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە لە سەر بەندەکانی، چونکە هەر چوار خاڵەکەی لەخۆ گرتوتەوە، خوای گەورە

دەفەرمووێت: ﴿وَالْعَصْرِ() إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ() إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُواالصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾[١] واتە: سوێند بە کات و ڕۆژگار، بەڕاستی هەرچی ئادەمیزاد هەیە بە تایبەت ئەوانەیان کە تەکلیفیان لەسەرە لەزیانێکی گەورە دایە جگە ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کارە چاکەکانیان کردووە وەسیەت و بانگەوازی یەکتر ئەکەن بۆ حەق و ڕاستی وەسیەت و بانگی یەکتر ئەکەن بۆ سەبر و خۆڕاگریی لەسەر حەق.

لە کۆتایی دەستمان بۆ قاپی خودای گەورە بەرز دەکەینەوە بۆ ئەوەی یارمەتیمان بدات بۆ هەموو کاری باش و موەفقمان بکات بۆ دوور بونەوەمان لە هەموو خراپەیەک و هەموو کارێک کە ببێتە هۆکاری تورەبونی خۆی لێمان، امین.

---

[١] - سورەتی العصر ١-٣

# فەرموودەی (٣٣)

# کێ تامی باوەڕی کردوە

**﴿عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ(رضي الله عنه)، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ يَقُولُ: ذَاقَ طَعْمَ الْإِيمَانِ مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا﴾**[١] واتە: لە هاوەڵی زۆر بەڕێزەوە عەباسی کوڕی عبدالمطلب (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە خۆشەویستی گەورەوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: تام و چێژی باوەڕی کردوە ئەو کەسەی بە اللَّه ڕازی بێت پەروەردیگاری بێت، و بە ئیسلام ڕازی بێت کە ئاین و یاسای ژیانی بێت، و بە محمد ﴿ﷺ﴾ ڕازی بێت پێغەمبەر و پێشەوای بێت.

**ڕوونکردنەوە:** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە باوەڕ تام و چێژی هەیە، بەڵام تەنها باوەڕدار چژتویەتی خوای گەورە لە ئەوانمان حساب بکات، بۆیە ئیمامی قورتوبی دەفەرمووێت: ڕازی بون دوو جۆرە، گشتی و تایبەت.

(١) گشتی ئەوەیە، کە تەنها اللَّه بە پەروەردیگاری خۆی بزانێت، و تەنها محمد بە پێغەمبەری خۆی ﴿ﷺ﴾ بزانێت، و تەنها ئیسلام بە دینی ڕاست بزانێت، ئەوە هەموو موسوڵمانێک دەگرێتەوە.

(٢) تایبەت، ئەوەیە کە بە هەموو یاسای خوای گەورە ڕازی بێت

[١] - مسلم ٣٤

و هەوڵ و تێکۆشان بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە بدات، و جگە خوای گەورە ڕەزامەندی بۆ هیچ شتێکی تر نەبێت، و جگە لە ڕێگا ئیسلام هەموو ڕێگایەك بە چەوتی و گومڕایی بزانێت، و هیچ قسە و فەرمانێک پێش فەرمانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نەخات، کەواتە، هەر کەسێک بەم شێوەیە بێت بەڕاستی تام و لەزەتی باوەڕ چۆتە ناو دڵ و دەرونی و سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناوە، کەواتە دەبێت بەو سێ بنچینە گەورەیە ڕازی بین تاکو مردن دەگاتە سەرمان.

هەر وەها دەبێت بە زوبان دانی پێدابنێین و لە دڵیشمان جێگیر بوبێت و بە کار و کردەوەش بیسەلمێنێت، خۆشەویستەکانم با تەماشای بێ باوڕان بکەین شانازی بە بێ دینی خۆیانەوە دەکەن و هەموو سەرو ماڵیان و هەرچی هەیانە لە پێناوی لە دەست بدەن پێیان هیچ نیە، ئەوجا هەر لە جوولەکەوە بگرە تاکو گاور و مانگا پەرست و مشک پەرستەوە، بەڵام جێگای داخە ئەمڕۆ موسوڵمان و باوەڕ پاکان زۆر جار بەخۆی شەرمە بڵێت من باوەڕدارم یاخود بڵێت من شوێنکەوتەی ئوممەتی محمدی سەروەرم ﴿ﷺ﴾ براکانم بابزانین خوای بێ هەوتا چۆن باسی باوەڕداری ڕاسنەقینە دەکات؟ ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾[1] واتە: جا کێ لەو کەسە گوفتار جوانتر و قسەی بەجێ ترە کە بانگەوازی کردووە بۆ لای خوای گەورە، کار و کردەوەی چاکیشی ئەنجام داوە، و وتوشیەتی: بەڕاستی من لە ڕیزی موسوڵمانانندام:

[1] ـ فصلت ٣٣

کەواتە، دەبێت مرۆڤی باوەڕدار شانازی بە باوەڕەکەیەوە بکات، بە تایبەتی لەو شوێنانەی ئیسلامی تێدا نامۆیە، بەڕاستی دەبێت زۆر وریا و ئاگاداری خۆمان بین نەوەک لە تەنگانە توشی ناخۆشیەک ببین و ڕابکەین بەرەو هەر شتێک ببێتە مایی ڕزگاربوونمان کەچی ئەو شتە حەرام بێت یاخود نا، چونکە تەنگانە هەڵێکی زێڕینە بۆ شەیتان و شەیتان دۆستان بزانە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ﴾[١] واتە: لە نێو خەڵکاندا هێندێ خەڵک هەیە دەڵێت: باوەڕم بە خوای گەورە هەیە کەچی کاتێکیش لەسەر خوا ئازارێکی توش دەبێت سزا و ئازاری خەڵکی وەکو سزای خوای باڵادەست دەگێڕێت بۆیە لە کۆتایش خۆی بۆ ڕاناگیرێت و پاشگەز دەبێتەوە لە باوڕەکەی. (پەنا بە اللَّه) بەڵام، با بزانین دەرچوانی قوتابخانەی خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ چۆن بوونە؟ یەکێک لەوان کەعبی کوڕی مالیکە (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) کاتێک پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لێی تورە بوو و قسەی لەگەڵی نەدەکرد لەبەر ئەوەی لە غەزای تەبوک دەرنەچوو لەگەڵ موسوڵمانان کەعب دەفەرمووێت: لەناو بازاڕی مەدینە کابرایەک خەڵکی شام بوو خواردنی دەفرۆشت دەیگوت: ﴿مَنْ يَدُلُّ عَلَى كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ؟ فَطَفِقَ النَّاسُ يُشِيرُونَ لَهُ حَتَّى إِذَا جَاءَنِي دَفَعَ إِلَيَّ كِتَابًا مِنْ مَلِكِ غَسَّانَ فَإِذَا فِيهِ أَمَّابَعْدُ فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنِي أَنَّ صَاحِبَكَ قَدْ جَفَاكَ، وَلَمْ يَجْعَلْكَ اللَّهُ بِدَارِ هَوَانٍ وَلَا مَضْيَعَةٍ فَالْحَقْ بِنَا

[١] - العنکبوت ١٠

**نُوَاسِكَ؛ فَقُلْتُ لَمَّا قَرَأْتُهَا وَهَذَا أَيْضًا مِنَ الْبَلَاءِ فَتَيَمَّمْتُ بِهَا التَّنُّورَ فَسَجَرْتُهُ﴾**[1]

واتە: کابراکە دەیگوت: کێ کەعبم پێ نیشان دەدات؟ خەڵکەکەش ئاماژەیان بۆ من کرد ئەویش هات بۆ لام و نامەیەکی دادەستم منیش کردمەوە لە پادشا غەسان بوو تێدا نوسرابوو خەبەرت پێیان گەیشتوە کە هاوڕێیەکەت (پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وازی لێت هناوە بەڵام خوا تۆ ڕسوا ناکەت وەرە بۆ لای ئێمە خزمەتت دەکەین (چونکە کەعب شاعیرێکی ناودار بوو) کەعب دەفەرمووێت: واللّٰە ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی ترە دەڵێت: منیش ڕاست نامەکەم دڕاند و سوتاندم.

کەواتە، لەسەر باوەڕەکەی خۆی لای نەدا و پاشگەز نەبووە چونکە دەرچووی قوتابخانەی پێشەوای مرۆڤایەتی بوو﴿ﷺ﴾، دەبێت بزانین تەنها کەعب وانەبوو، بەڵکو هاوەڵان بەتێکڕا وابوون، بزانە خوای گەورە چۆن باسی هاوەڵانی پێغەمبەر دەکات لە تەنگانە؟ و دەفەرمووێت: **﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾**[2] واتە: لەو کاتەی هاوەڵان لە تەنگانە و نارەحەتی دابوون چونکە بێباوەڕەکان گەمارۆیان دابوون لە جەنگی خەندەق هەندێک لە بێباوەڕان بە هاوەڵانیان گوت: خەڵکان بۆتان کۆبونەتەوە هاوەڵانیش باوەڕیان زیاتر و پتەوتر دەبوو و بەبێ دوودڵی فەرموویان: خوای گەورەمان بەسە و باشترین پاڵپشتە.

[1] - البخاري ٤٤١٨
[2] - آل عمران ١٧٣

واتە: ئەو سێ شتە دەبێت ئێمە لە ژیانی خۆمان فەرامۆش نەکەین چونکە لە ناو گۆریش پرسیاری ئەو سێ بنچینەیەمان لێ دەکرێت، هەر وەکو پێغەمبەری ئاخر زەمان ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: هەر کەسێک بمرێت دوو فریشتە لەناو گۆڕەکەی پێی دەڵێن: ﴿مَنْ رَبُّكَ؟ وَمَا دِينُكَ؟ وَمَنْ نَبِيُّكَ؟﴾[1] واتە: کێیە پەروردیگارت؟ لەسەر چ دینێک بووی؟ کێیە پێغەمبەرەکەت.

هەر کەسێک لە دونیا خوای بێ هاوتای نەپەرستبێت و لە ژێر فەرمانەکانی نەبوبێت ناتوانێت بڵێت اللّٰه ربی، و هەر کەسێک ئیسلامی نەکردبێتە دەستور و یاسای هەموو ژیانی ناتوانێت بڵێت ئیسلام ئاینمە، و هەر کەسێکیش پێغەمبەری دڵسۆزی ﴿ﷺ﴾ نەکردبێتە ڕابەر و پێشەوای خۆی بە شانازیەوەش ناتوانێت بڵێت محمد پێغەمبەرمە ﴿ﷺ﴾ چونکە ئازیزەکانم مرۆڤ لەسەر هەر شتێک بژیت هەر لەسەر ئەویش دەمرێت و لەسەر هەر شتێکیش بمرێت هەر لەسەر ئەو شتە زیندوو دەبێتەوە، گەورەترین بەڵگەی بەرچاویش لەسەر ئەوە بابچینە نەخۆشخانەکان و ببینین ئەوانەی تازە لە نەشتەرگەری هاتونەتە دەرەوە و هێشتا بەنج بەری نەداون تەنها باسی ئەوشتانە دەکەن کە ڕۆژانە لەسەری بوونە! ئێمەش لەسەر هەر شتێک بمرین کە زیندوو دەبینەوە وادەزانین وا لە هەمان شوێنین! داوامان لە خالقی گەورەیە کە لەسەر تەوحید بمانژێنیت و هەر لەسەر تەوحیدیش بمرین و لە ژێر بەیداخی (لاإله إلاالله)زیندوومان بکاتەوە ئامین.

---

[1] - الترمذی/٣١٢٠.

# فەرموودەی (٣٤)

# شاهیدی خەڵک بۆ باوەڕ

﴿عَن فَضَالَةُ بْنُ عُبَيْدٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ: أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِالْمُؤْمِنِ؟ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ وَالْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ النَّاسُ مِنْ لِسَانِهِ وَ يَدِهِ وَ الْمُجَاهِدُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ فِي طَاعَةِ اللَّهِ وَالْمُهَاجِرُ مَنْهَجَرَ الْخَطَايَا وَالذُّنُوبَ﴾[1] واتە: لە هاوەڵی خۆشەویستەوە فوزالەی کوڕی عوبەید (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە خۆشەویستی مەزنەوە ﴿ﷺ﴾ لە حەجی ماڵئاوای فەرمووی: ئایا پێتان ڕابگەیێنم باوەڕدار کێیە؟ باوەڕدار ئەو کەسەیە خەڵک لێی ئەمین بن لەسەر وماڵیان، و موسوڵمانیش ئەو کەسەیە کە خەڵك لە دەست و زوبانی سەلامەت بن، و موجاهید و تێکۆشەریش ئەو کەسەیە کە تێبکۆشێت لەگەڵ نەفس و ئارەزووەکانی لە پەرستنی خوای گەورە، و کۆچ کە ریش ئەو کەسەیە کە کۆچ بکات لە تاوان و کوناهەکان.

**ڕوونکردنەوە:** هەر کەسێک باوەڕداربێت هەر کاتێک باوەڕ بچێتە ناو دڵی خاوەنەکەی وای لێدەکات سنورەکانی خوای بێ هاوتا نەبەزێنێت، ڕاست گوتن لە کردەوەکەی و پاراستنی ئەمانەت و خۆ دوور گرتن لە ستەمکردن ئەوجا

---

[1] - أحمد/٢٣٩٥٨

خەڵک لێی ئەمین دەبن چونکە، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: **﴿لا إيمان لمن لا أمانة له﴾**[1] واتە: باوەڕی نیە ئەوەی ئەمانەت پارێز نەبێت.

موسوڵمانیش ئەو کەسەیە کە خەڵک لە خراپەی دەست و زوبانی سەلامەت بن، چونکە موسوڵمان چی بۆ خۆی پێی خۆش بێت دەبێت ئەویشی بۆ تێکرای موسوڵمانان پێ خۆش بێت، واتە چی بۆ خۆی پێ ناخۆش بێت دەبێت ئەویشی بۆ موسوڵمانان پێ ناخۆش بێت، موجاهید و تێکۆشەریش ئەو کەسەیە کە نەفسی خۆی لە سەر گوێرایەڵی خوای گەورە ڕا بێنێت چونکە نەفس فەرمان دەکات بە تەمبەڵی و ئیسراحەتی پێ خۆشە، جیهادی نەفسیش چوار جۆرە،

(١) فێربونی زانستە شەرعیەکان بۆ ئەوەیی بەرچاو ڕوون بێت.

(٢) کار کردن بەو زانستەی فێری بووە چونکە زانستێك کاری پێ نەکرێت ئەگەر زەرەریشی نەبێت بەڵام بێگومان هیچ سوودی نیە

(٣) بانگەوازیکردن بۆ ڕێی ڕاستەکەی ئیسلام نەوەک لەو کەسانە بێت کە دینی خوای گەور دەشارنەوە و توشی نەفرت ببن چونکە خوای گەورە دەفەرمووێت: **﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَ الْهُدَىٰ مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَـٰئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّـهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ﴾**[2] واتە: بەراستیی ئەوانەی ئەو بەرنامەو ڕێنمایە دەشارنەوە کە لەو کتێبەدا هەیە بۆ شارەزابونی خەڵک لە دوای

---

[1] - أحمد ١٢٣٨٣

[2] - البقرة ١٥٩

ئەوەی لە پەیامەکەی خۆمان ڕوونمان کردۆتەوە خوای گەورە نەفرینیان لێ دەکات و تەواوی نەفرین کارانیش نەفرینیان لێ دەکەن.

کەواتە، با ئاگامان لێ بێت

(٤) سەبرو ئارامگرتن لە سەر بانگەوازی و ئازاری خەڵک لە ڕێگای بانگەوازی، ئەو چوار خاڵە زۆر قورسە لە سەر نەفسی بەندە، کۆچکاریش ئەو کەسەیە کۆچ بکات لە بێ دینی بەرەو دینداری کۆچ بکات لە خراپە بۆ چاکە ئەو جۆرە کۆچە واجبە لەسەر هەموو موسوڵمانێک، کەواتە ئازیزەکانم دەبێت بزانین باوەڕداری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە سەروەرمان ﴿ﷺ﴾ بۆمان پێناسەی کردوە ئەویش دەبێت هەموو خەڵک لە زەرەر و زیانەکانی نەترسن واتە ئەمین و دەست پاک بێت لە هەموو ژیانیدا، موسوڵمانیش ئەو کەسەیە نەک تەنها زەرەری نەبێت بۆ خەڵک بەڵکو دەبێت سوودیشی بۆ خەڵک هەبێت بە هەموو جۆرەکانیەوە و ئەگەر سوودیشی بۆ خەڵک نەبێت با ئازاریشی نەبێت دەنا دەبێت لە باوەڕەیەکەی خۆی بترسێت نەوەک لە بازنەی ئیسلام دەربچێت، بەبێ ئەوەی ئاگاشی لە خۆی هەبێت و با لەبیریشمان بێت جیهادیش چەندەها جۆری هەیە، لە پێش هەمووان بەڵکو لە هەموویان گرینگ تر و لە پێشتر ئەوەیە جیهادکردنە لەگەڵ حەز و ئارەزووەکانی خۆی بکات، چونکە هەندێک جار نەفس و هەوا و ئارەزو ئاوا زاڵ دەبێت لەسەر خاوەنەکەی تاوەکو جێگای خوای گەورە دەگرێتەوە، هەر وەکو خوای بێ هاوتا فەرموویەتی: لە قورئانی

پیرۆز: ﴿أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَـٰهَهُ هَوَاهُ﴾[١] واتە: ئایا تۆ ئەو کەسەت بینیوە کە هەوا و ئارەزوی خۆی کردوتە خوا و دەیپەرستێت؟!

واتە، هەر کەسێك جگە لە ئایینی خوای بە هەق پەیڕەو بکات و شوێن هەوا و هەوەسی خۆی کەوتوە، کەواتە دەبێت پێش هەموو دوژمنێک جەنگ و دژاتی نەفس و هەوای خۆمان بکەین چونکە هەر کەسێک زاڵ نەبێت بەسەر نەفسی خۆی با بزانێت بەسەر هیچ دوژمنێکی زاڵ نابێت، دەبێت بزانین خوای گەورە بەهەشتی کردوتە پاداشت بۆ ئەو کەسەی پێچەوانەی هەوا و ئارەزووەکانی خۆی هەڵسوکەوت دەکات، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز فەرموویەتی: ﴿أَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى () فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى﴾[٢] واتە: ئەو کەسەی لە گەورەیی و دەسەڵات و وەستان لە دادگای پەروەردگاری خۆی ترسابێت و جڵەوی نەفسی لە هەواو ئارەزوی خۆی گرتبێتەوە ئەوە بێگومان بەهەشتە جێگای مانەوە و حەوانەوەی.

خۆشەویستانم بەڕاستی جێگای حەیف و داخە مرۆڤی باوەڕدار ناز و نیعمەتی بەهەشت لە دەست بدات بۆ خۆشییەکی کەمی دونیا پێغەمبەری سەروەرمان ﴿ﷺ﴾ دەربارەی ئەو ئافرەتانەی لە بەهەشت دان، دەفەرمووێت: ﴿لَوْ أَنَّ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ اطَّلَعَتْ إِلَى أَهْلِ الْأَرْضِ لَأَضَاءَتْ مَا بَيْنَهُمَا وَلَمَلَأَتْهُ رِيحًا

---

[١] - الجاثية ٢٣

[٢] - النازعات ٤٠-٤١

﴿وَلَنَصِيفُهَا عَلَى رَأْسِهَا خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا﴾[1] واتە: ئەگەر ئافرتێکی ناو بەهەشت دەرکەوێت بۆ سەر زەوی ئەوە هەموو زەوی ڕووناک دەکاتەوە و پڕی دەکات لە بۆنی خۆش تەنها لەچکەکەی سەری لە هەموو دونیا و ئەوەی لە ناو دونیادای چاکتر و باشترە.

بەڕاستی حەیفە بیگۆڕینەوە لەگەڵ خۆشیەکی کەمی دونیای کاتی، داوامان لە خوای باڵا دەستە هاوکاریان بکات بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خۆی و بەهەشتە نەبڕاوەکەی خۆی و بێبەشیشیان نەکات لە بینینی خۆی و خۆشەویستەکەی خۆی لە بەهەشتی فیردەوسی بەرز ئامین.

---

[1] - البخاري ٢٧٩٦

## فەرمووده‌ی (٣٥)
## گەورەیی سەلام کردنە لە ئیسلامدا

﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ لَا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا أَوَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ﴾[1] واتە: لە هاوەڵی خۆشەویستەوە ئەبوهریرة (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە پێشەوای سەرورەوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ناچنە بەهەشتەوە تاوەکو باوەڕ نەهێنن و باوەڕیش ناهێنن تاوەکو یەکتریتان خۆش نەوێت ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر بیکەن یەکتریتان خۆش بوێت؟ ئەوە سەڵام لە ناوەخۆتان بڵاو بکەنەوە.

**ڕوونکردنەوە:** واتە؛ ئیسلام ئێمەی لە خەڵک جیا کردوتەوە بە سەلام و سەلامیش دەبێتە مایەی خۆش ویستنی یەکتر و پاداشتیشی لەسەر وەردەگرین کەواتە نابێت بیگۆڕیینەوە بە ووشەیەکیتر کە جێگای ناگرێتەوە وەکو (چۆنی، ڕۆژباش، شەو باش) هێنانی ئەو ووشانە فێل و تەڵەی کافرانە چونکە حەسوودیان پێ دەبەن سەرورمان ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ﴿مَا حَسَدَتْكُمُ الْيَهُودُ عَلَى شَيْءٍ مَا حَسَدَتْكُمْ عَلَى السَّلَامِ وَ التَّأْمِينِ﴾[2] واتە: جوولەکەحەسوودیتان

---

[1] - مسلم ٥٤

[2] - إبن ماجه ٨٥٦

پێ نابەن لە هیچ شتێک وەکو حەسوودی بردنیان پێتان لە سەلام و ئامین، چونکە، سەلام کردن تایبەت مەندیەکە لە تایبەت مەندیەکانی ئیسلام و دەبێتە هۆی خۆشەویسی و یەك ڕێزی تەبایی موسوڵمانان، سەلام کردنیش سێ برگەیە (السلام علیکم و رحمةالله و برکاته) سی چاکەی لەسەر وەردەگیرێت، سەلام کردنیش لە چاکترینی ئیسلامە، هەر وەکو لە پێغەمبەری گەورەوە ﴿ﷺ﴾ پرسیار کرا چاکترینی ئیسلام چیە؟ فەرمووی: ﴿تُطْعِمُ الطَّعَامَ وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ﴾[1] واتە: خواردن ببەخشی و سەلام بکەی لە ئەوەی بیناسی و ئەو کەسەی نەیناسی، چونکە (سەلام) یەکێکە لە ناوەکانی خوای گەورە، و بیزانین خوای بێ هاوتا سەلامی کردۆتە سەڵاوی هەموو نەوەی ئادەم (علیه السلام) لەو کاتەی خوای گەورە باوکمان ئادەمی دورست کرد پێی فەرموو: ﴿اذْهَبْ فَسَلِّمْ عَلَى أُولَئِكَ مِنَ الْمَلَائِكَةِ فَاسْتَمِعْ مَايُحَيُّونَكَ تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ. فَقَالَ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ فَقَالُوا السَّلَامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ﴾[2]واتە: بڕۆ سەلام لە فریشتەکان بکە و گوێ بگرە بەچ وەڵامت دەدەنەوە، سەلامی خۆت و نەوەکانتە ئادەم فەرمووی: السلام علیکم ئەوانیش گوتیان: السلام علیك ورحمةالله.

واتە، لەنێو ئیسلامدا گرنگیەکی تایبەتی پێ دراوە هەر وەکو عبداللەی کوڕی سەلام (ڕەزای خوای گەورەی لێ بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە ودەفەرمووێت: ئەو

---

[1] - البخاري/١٢

[2] - البخاري ٣٣٢٦

کاتەی پێغەمبەری خۆشەویست ﴿ﷺ﴾ هاتە مەدینەی پیرۆز خەڵک ڕۆیشتن بۆ پێشوازی منیش ڕۆیشتم بۆ بینینی کە ڕوخساری پیرۆزیم بینی زانیم ئەم دەم و چاوە درۆزن نیە، یەکەم شت فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَفْشُوا السَّلَامَ وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ وَصَلُّوا والنَّاسُ نِيَامٌ، تَدْخُلُوا الْجَنَّةَبِسَلَامٍ﴾[1] واتە: ئەی خەڵکینە سەلام لە نێو خۆتان بەرپا بکەن و خواردن ببەخشن و نوێژ ئەنجام بدەن لەو کاتەی خەڵک نوستوونە دەچنە بەهەشتەوە بە سەلامەتی.

بۆیە سەلام هۆکاری ئاشتی و ئارامیە لە نێو تاکەکانی کۆمەڵگا و هۆکاری خۆشەویستیە و لەسەر هەموویانەوە هۆکاری چونە بەهەشتە، بەڕاستی جێگای داخە ئەوەی ئێستا لە نێو موسوڵمانان دەبینین و دەبیستین چونکە لە ئاینەکەمان دور کەوتوینەوە و لە مەبەستەکانی ئاینی ئیسلام تێنەگەیشتوین بۆیە دورشمەکانی ئیسلامان فەرامۆش کردوە، ئازیزەکانم بە دووری مەزانن بە یەک سەلام بچینە بەهەشتەوە چونکە هەندێک بەندە لە دوا ڕۆژ یەک چاکەی پێویستە پێی بچێتە بەهەشتەوە، خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ﴿لَاتَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا وَ لَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلَقٍ﴾[2] واتە، هیچ چاکەیەک بە کەم مەزانە ئەگەر زەردە خەنەیەکیش بێت بەڕوی براکەت.

[1] - الترمذي ٢٤٨٥
[2] - مسلم/٢٦٢٦

کەواتە، باوەڕداری ڕاستەقینە دەبێت هەموو ئاینی ئیسلامی قبوڵ بێت و هەموو ئیسلامیش لە خۆی بێنێتە دیٚ چونکە خوای گەورە فەرمانمان پیٚ دەکات و دەفەرموویٚت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ﴾[1] واتە: ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە لە هەموو لایەکەوە بڕۆنە ژێر سایەی ئیسلامەوە و هەر هەمووشی بە تەواوەتی پەیڕەو بکەن.

چونکە، بەش بەش کردنی ئاین، ڕێگاو ڕێبازی باوەڕداران نیە، بەڵکو ڕێبازی ئوممەتەکانی پێش ئیسلامە هەر وەکو خوای باڵا دەست دەربارەی جوولەکەکان دەفەرموویٚت: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ﴾[2] واتە: باشە چۆن حەق ڕەوایە باوەڕتان بە بەشێکی بەرنامەکەی خوای گەورە هەبێت و بە بەشێکی تری کافربن و حاشای لێبکەن.

بەڵام ڕاستی فەرمووە سەروەری پێشەوامان ﴿ﷺ﴾ کە فەرمووی: ﴿لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ مَنْ قَبْلَكُمْ شِبرًا بِشِبرٍ وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ﴾[3] واتە: شوێنکەوتەی پێشینانتان (جوولەکە و گاورەکان) دەکەون بست بە بست و گەز بە گەز.

کەواتە، خۆشەویستان با بگەڕێینەوە بۆ سەر ئەو ڕێبازەی کە پێشینە چاکەکانمان لە سەری بوونە چونکە سەرکەوتن و بردنەوەی دونیا و دواڕۆژ لە ڕێبازی ئەواندایە هەروەکو پێشەوا مالیك (ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) دەفەرموویٚت: ﴿لن

[1] - البقرة - ٢٠٨

[2] - البقرة - ٨٥

[3] البخاري- ٣٤٥٦

**يُصلِحَ آخرَ هذه الأمة إلا ما أصلَحَ أولَها﴾**[1] واتە: بەڕاستی هیچ شتێک کۆتای ئەم ئوممەتە ڕاستە ڕێ ناکات تەنها ئەوە نەبێت کە سەرەتای ئەم ئوممەتە لە سەری بوونە.

ئەویش ڕێگای پێغەمبەری پێشەوایە ﴿ﷺ﴾ کەواتە، خۆشەویستان با سەلام لە نێو خۆمان بڵاو بکەینەوە بۆ ئەوەی ببینە ئوممەتی سەلام و ببینە بەندە ڕاستەقینەکانی خوای سەلام بە ئومێدی ئەوەی لە دەرگای سەلام بچینە بەهەشتی سەلامەوە بۆیە دەڵێین: ٱللهم أنت السلام و منك السلام تباركت ياذا الجلال و الإكرام أدخلنا برحمتك دار السلام بأمان و سلام يا قدوس ياسلام ، ئامین.

---

[1] - اقتضاء صراط المستقيم ص٤٦٧

## فەرموودەی (٣٦)

## بەندە لە نێوان ترس و ئومێد

**﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ قَالَ: لَوْ يَعْلَمُ الْمُؤْمِنُ مَا عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الْعُقُوبَةِ مَا طَمِعَ بِجَنَّتِهِ أَحَدٌ وَلَوْ يَعْلَمُ الْكَافِرُ مَا عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الرَّحْمَةِمَا قَنَطَ مِنْ جَنَّتِهِ أَحَدٌ﴾**[١] واتە: لە هاوەڵی خۆشەویستەوە ئەبوهریرة (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە پێغەمبەری سەروەرەوە ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەگەر باوەڕدار بیزانیبایە چ سزایەک لای خوای گەورە هەیە هیچ کەسێك ئومێدی بە بەهەشت نەدەبوو، و ئەگەر بێ باوەڕیش بزانێت خوای گەورە چەند بە بەزەییە هیچ کەسێک بێ ئومێد نەدەبوو لە بەهەشت.

**ڕوونکردنەوە:** ئەم فەرموودەیە فێرمان دەکات بەردەوام هەوڵبدەین بۆ بەهەشت، دەبێت بیزانین خوای گەورە لێیان خۆش نابێت بە بێ کاری چاکە، چونکە زۆرێک لە ئەهلی تەوحید دەچنە دۆزەخەوە بە هۆی تاوان و کەمتەر خەمیانەوە لە پەرستشەکان، چونکە ئەوەی ئومێدی بە بەزەیی خوای گەورە هەبێت با هەوڵبدات و شەونخونی بۆ بکات، ئەم فەرموودەیە هەردوو لایەنی دینداری کۆکردوتەوە (خوف و رجاء) واتە ترس، و ئومێد، واتە، ئەگەر باوەڕدار بزانێت

---

[١] - مسلم ٢٧٥٥

خوای گەورە چ جۆرە سزایەکی داناوە بۆ بێ باوەڕان یاخود بۆ تاوانباری باوەڕدار، لە دونیا و لە دوارۆژدا؟ زۆر خۆپارێز دەبوو لە تاوان و هیچ کەمترخەمیشی نەدەکرد لە چاکەکان، واتە سزا و عقوبەی خوای باڵا دەست ئەوندە بە ترس و ئازارە دەبێت باوەڕداریش خۆی دوور بخاتەوە لەو شتانەی کە دەبێتە هۆی توش بون بە سزای دۆزەخ، چ جای کافر و بێباوەڕ، کەواتە باوەڕدار دەبێت چاکە ئەنجام بدات لە ژیانیدا بە ئومێدی پاداشتی خوای باڵا دەست و خۆشی دوور بخاتەوە لە تاوان لە بێ فەرمانی، لە ترس و خەشمی خوای باڵا دەست، بزانە خوای گەورە چۆن باسی سیفەتی باوەڕداران دەکات لە قورئاندا؟ دایکی باوەڕداران عایشا (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) دەفەرمووێت: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کرد دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ﴾[1] واتە: ئەوانەی لەو ماڵەی خوای بەخشندە پێیداون دەبەخشن کەچی دڵیان دەلەرزێ لە گەڕانەوەیان بۆ لای پەروەردگاریان.

واتە: لەو ڕۆژە دەترسن کارەکانیان پووچەڵ ببێتەوە، عایشا دەفەرمووێت: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەوانە هەون کە ئارەق دەخۆن و دزی دەکەن؟ پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ﴿لَا يَا بِنْتَ الصِّدِّيقِ وَلَكِنَّهُمُ الذِينَ يَصُومُونَ

---

[1] - المؤمنون ٦٠

﴿وَيُصَلُّونَ وَيَتَصَدَّقُونَ وَهُمْ يَخَافُونَ أَنْ لَا يُقْبَلَ مِنْهُمْ﴾[1] واتە: نەخێر ئەی کچی ڕاستگۆ (ئەوانە کەسانێکن کە بەڕۆژو دەبوون و نوێژیان ئەنجام دەدا و ماڵیان دەبەخشی کەچی دەترسن لێیان وەرنەگیرێت،

بەڵام لەگەڵ ئەمەش بێ ئومێد نابن لە بەزەیی خوای گەورە چونکە بێ ئومێدی لە سەر زاری پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) بە گومڕایی ناو براوە، لەو کاتەی فریشتەکان مژدەی منداڵیان پێ دا پێیان گوت بێ ئومێد مەبە پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) فەرمووی: ﴿وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِ إِلَّا الضَّالُّونَ﴾[2] واتە: ئیبراهیم فەرمووی: دەبێ کێ لە میهرەبانی پەروەردگاری خۆی نائومێد بێ، بەدەر لە گومراکان.

وە هەروەها بێ ئومێدی لەسەر زاری پێغەمبەر یەعقوب (علیه السلام) بە کوفر ناو براوە، کە لەو کاتەی بە کوڕەکانی فەرموو: بڕۆن لە یوسف و براکانی بگەڕێن ئەمە لە دوای زیاتر سی ساڵ هەر وەکو خوای گەورە لەسەر زاری پێغەمبەر یە عقوب دەفەرموویت: ﴿وَلَاتَيْأَسُوا مِن رَّوْحِ اللَّـهِ إِنَّهُ لَايَيْأَسُ مِن رَّوْحِ اللَّـهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ﴾[3] واتە: هەرگیز نا ئومێد مەبن لە ڕەحم و بەزەیی خوای گەورە چونکە مەگەر هەر بێ باوەڕان لە ڕەحم و بەزەی خوای گەورە بێ هیوا و نائومێد دەبن.

---

[1] - الترمذی ٣١٧٥
[2] - الحجر ٥٦
[3] - یوسف ٨٩

کەواتە، دەبێت بەندایەتی بۆ خوای گەورە ئەنجام بدەین بە ئومێدی چونە بەهەشت و هەروەها خۆشمان لە تاوان و سەرپێچی خوای مێهرەبان بەدوور بگرین بۆ ئەوەی لە خەشم و عەزابی خوای گەورە ڕزگاربین بە هیوای ئەوەی خوای گەورە پێمان بفەرمووێت: **﴿قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ، فَأَعْطَيْتُهُمْ مَا سَأَلُوا وَأَجَرْتُهُمْ مِمَّا اسْتَجَارُوا﴾**[1] واتە: لێیان خۆش بوم و پێیانم بەخشی ئەو شتەی داوا دەکەن و لەو شتەش ڕزگاریان دەکەم کە پەنام دەگرن لێی.

داوامان لە خالقی گەردونە موەفقمان بکات بۆ هەموو چاکەیەک و دوورمان بخاتەوە لە هەموو سەرپێچیەک ئامین.

---

[1] - مسلم ٢٦٨٩

# فەرموودەی (٣٧)

# گەورەی قورئان خوێندن

﴿عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْأُتْرُجَّةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَ طَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ التَّمْرَةِ لَا رِيحَ لَهَا وَطَعْمُهَا حُلْوٌ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الرَّيْحَانَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ، لَيْسَ لَهَا رِيحٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ﴾[1] واتە: لە هاوەڵی ڕێزدار عبداللَّەی کوڕی قەیسەوە (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە پێغەمبەری پێشەوا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: نموونەی باوەڕداری قورئان خوێن وەکو پرتەقالە تامی خۆشە و بۆنیشی خۆشە، و نموونەی ئەو باوەڕدارەی قورئان ناخوێنێت وەکو خورما وایە، بۆنی نیە بەڵام تامی شیرینە، و نموونەی دووڕوی قورئان خوێن وەکو ڕیحانە بۆنی خۆشە بەڵام تامی تاڵە، و نموونەی ئەو دووڕوەی قوڕئان ناخوێنێت وەکو شەمامکە وایە هیچ بۆنی نیە و تامیشی تاڵە، واتە، باوەڕدار هەر هەمووی خێر و چاکەیە بۆ خۆی و بۆ دەور و بەری بە تایبەت ئەو باوەڕدارەی قورئان خوێنە دڵی پاکە لە بەر باوەڕەکەی و هەڵسوکەوتیشی جوانە بە هۆی بەرەکەتی قورئان،

---

[1] - البخاري/٥٤٢٧

بۆیە پێغەمبەری پێشەوا ﴿ﷺ﴾ نموونەی بە پرتەقال هێناوەتەوە لە ناو هەموو جۆرە میوەیەك، چونکە پرتەقال بۆنی خۆشە و تامیشی خۆشە و وێنەشی جوانە، بەڵام جێگای حەیف و داخە کە دەبینین قورئان بۆ دونیا دەخوێندرێت، بەڵام ئەو باوەڕدارەی قورئان ناخوێنێت وەکو خورما وایە تامی شیرینە بەڵام بێ بۆنە، واتە، باوەڕداری قورئان ناخوێنێت لە تام یەکسانە لەگەڵ ئەو قورئان خوێنەی باوەڕدارە چونکە ناوەڕۆکیان باوەڕی تێدایە، بۆیە هەردوکیان تامیان خۆشە، بەڵام جیاوازیان هەیە لە بۆنەکە، بەڵام نموونەی دووڕوی قورئان خوێن وەکو ڕیحانە بۆنەکەی خۆشە لەبەر ئەو قورئانەی دەحێنێت، بەڵام تامی تاڵە چونکە دڵی پڕە لە کوفر و ڕق لە ئیسلام و موسوڵمانان، بەڵام لەویش خراپتر دووڕوی قورئان نەخوێنە چونکە دڵ و ڕوخساری هەردوو وێرانە، واتە: دونیا و دواڕۆژی فەوتاندوە. (پەنا بەخواە گەورە).

**ڕوونکردنەوە:** لەم فەرموودەیە پێغەمبەری سەروەر ﴿ﷺ﴾ خەڵکانی کردۆتە دوو بەشەوە باوەڕدار و دووڕوو، چونکە مرۆڤ یان کارو کردەوەکان بە ئیخلاسیەوە ئەنجام دەدات کە ئەویش باوەڕدارە، یان کردارەکانی بۆ دونیایە، کە ئەویش دووڕووە پەنا بەخوای گەورە، ئەوجا باوەڕداریشی بۆمان کردۆتە دوو بەش، یان قورئان خوێنە یان نە، ئەوجا پێغەمبەری سەروەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: نموونەی باوەڕداری قورئان خوێن وەکو پرتەقال وایە بۆنی خۆشە و تامیشی خۆشە، واتە هەرگیز لە چاکەکانی باوەڕداری قورئان خوێن بێ بەش نابی هاوڕێیەتی لە

گەڵیدا قازانجە و دانیشتن و قسەکردن و موعامەلە لەگەڵیدا هەر قازانجە، چونکە هەموو کارەکانی دیندارییە و ئەو قورئانەی دەیخوێنێت لێی تێدەگات و کاری پێ دەکات، نەوەک بە داخەوە قورئان خوێنەکانی ئەمڕۆ قورئان خوێندنیان بۆتە پیشە بۆ بەدەست هێنانی پارە و ناوبانگ هەر وەکو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ﴿**فإِنَّه سيجيئ أقوام يقرءون القرآن و يسألون به الناس**﴾[1] واتە: کەسانێک دێن قورئان دەخوێنن و داوای پاداشتەکەی لەخەڵک دەکەن.

چاکترین کەسانێکیش قورئانیان خوێندبێت و کاریشیان پێ کردبێت هاوەڵانی پێغەمبەر بوون ﴿ﷺ﴾ و (ڕەزای خوایا تعالی یان لێ بێت) کەواتە، هەر کەسێک پێ خۆش بێت بۆنی خۆش بێت و تامیشی خۆش بێت با چاو لە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ و هاوەڵان بکات بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەوان حەشر بکرێت، کۆمەڵی دووەمیش ئەو باوەڕدارانەی کە قورئان ناخوێنن ئەوانیش ئەگەر بۆنیشیان نەبێت بەڵام تامیان شیرینە وەکو خورما بێ بۆنە بەڵام خۆی شیرینە، چونکە باوەڕدار نابێت هیچ سوودێکی بۆ دەور و بەری نەبێت، بەڵام دووڕووەکانی قورئان خوێن نموونەیان وەکو ڕیحانە بۆنی خۆشە بەڵام تامی تاڵە، خۆشەویستان بزانن قورئان ئەوەندە گەورەیە دووڕووەکانیش پلە دار و گەورە دەکات، واتە با دووڕوش بێ هەندێک جار سوودی هەیە وەکو دەنگ خۆشی یاخود هەندێک پرسیاری قورئان وەڵام دەداتەوە، بەڵام کاری پێ ناکات بۆیە

---

[1] - الترمذی ٢٩١٧

نموونەی وەکو ڕەیحانە بۆن خۆشە و تامی تاڵە، بەڵام دووڕوی قورئان نەخوێن هەمووی شەڕ و خراپەی کۆکردوتەوە، چونکە نە باوەڕی بە قورئان هەیە و نە کاریش بە قورئان دەکات، واتە بەڕێزەکانم مرۆڤ لەم چوار بەشە بەدەر نیە با هەوڵ بدەین لە بەشە چاکەکە بین، چونکە، پێغەمبەری مەزن ﴿ﷺ﴾ فێرمان دەکات و هانمان دەدات بۆ پلە بەرزەکان، هەر وەکو دەفەرموویت: ئەگەر داوای بەهەشتان کرد لە خواە گەورە؟ داوای بەهەشتی فیردەوس بکەن چونکە خۆشترین و بەرزترینی بەهەشتەکانە، بزانە گەورەیی قورئان، جبریل قورئانی دابەزاند بووە گەورەی فریشتەکان، قورئان بۆ محمد ﴿ﷺ﴾ دابەزی بووە گەورەی پێغەمبەران، قورئان بۆ کۆتا ئومەت دابەزی بووە چاکترینی ئومەتان،

قورئان لە ڕەمەزان دابەزی بووە گەورەی مانگەکان،

قورئان لە شەوی قەدر دابەزی بووە گەورەترین شەوەکان،

گومانتان نە بێت چاکترینی ئەو ئوممەتە دەبێتە هەڵگری قورئان، هەر وەکو خوای باڵا دەست فەرموویەتی: ﴿أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا﴾[1]

واتە: ئەم قورئانەمان کردە میرات بۆ ئەو بەندانەمان کە هەڵمان بژاردن.

داوامان لە خوای مێهرەبانە لە چینی هەرە باشەکەمان هەژمار بکات ئەگەر بە کارەکانیشمان شایەنی ئەو پلەیە نەبێت، بەڵام بەزەیی ئەو شایەنە بمانگرێتەوە ئامین.

[1] - فاطر ٣٢

# فەرموودەی (٣٨)

# خواردنی باوەڕدار و بێ باوەڕ

﴿عَنْ أَبِي مُوسَى (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾ قَالَ: الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ، وَالْكَافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ﴾[١] واته: له هاوەڵی بەڕێزەوە عبدالله کوڕی قەیسەوە (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) له پێغەمبەری پێشەواوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: باوەڕدار بە یەک ڕیخۆڵە نان دەخوات بەڵام بێباوەڕ بە حەوت ڕیۆڵە نان دەخوات، کابرایەک زۆر خواردنی دەخوارد بێش موسوڵمان بوونی بەڵام کە موسوڵمان بو خواردنی زۆر پێ نەدەخورا ئەویش بۆ پێغەمبەری خوای ﴿ﷺ﴾ باسکرد، پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: باوەڕدار بە یەک ڕیخۆڵە خواردن دەخوات، بەڵام بێ باوەڕ بە حەوت ڕیخۆڵە دەخوات.

**ڕوونکردنەوە:** زاناکانی ڕاڤەی فەرموودە فەرموویانە: مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە، باوەڕداری تەواو دەزانێت دونیا کاتیە و جێگای خۆشی وحەوانەوە نیە، بۆیە زۆرگرنگی بە خۆراک و خۆش گوزەرانی نادات، بۆیە تەنها لە حەڵاڵ دەخۆن ئەگەر کەمیش بێت، ئەگەر حەڵاڵیان دەست نەکەوێت حەرام ناخۆن ئەگەر پێویستش بن، دەبێت بیزانین خواردنی حەڵاڵ ئەگەر زۆریش بێت

---

[١] - مسلم ٢٠٦٢

جێگای ڕخنە نیە چونکە زانراوە خواردن ڕێ پێ دراوە (مباح) بەڵام باوەڕداری لە خواترس نەفسی خۆی ڕادێنێت بۆ ئەوەی فێرە قەناعەت بێت ڕێگا نادەت نەفسی تێربێت، لە مەلەزات وخۆشی، چونکە تێربونی گەدە بەڵایە هەر وەکو پێغەمبەری سەروەر ﴿ﷺ﴾دەفەرموویت: ﴿مَا مَلأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ، بِحَسْبِ ابْنِ آدَمَ أُكُلاَتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كَانَ لاَ مَحَالَةَ، فَثُلُثٌ لِطَعَامِهِ وَثُلُثٌ لِشَرَابِهِ وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ﴾[١] واتە: نەوەی ئادەم هیچ شتێکی پڕ نەکردوە خراپتربێت لە گەدەی، بەسە بۆ نەوەی ئادەم چەن پاروێک بخوات، ئەگەر نا با گەدەی خۆی بکاتە سێ بەش، بەشێکی بۆ خواردن و بەشێکیشی بۆ خواردنەوە و بەشێکیشی بۆ هەناسەی، چونکە تێربونی گەدە هۆکارە بۆ بەهێزبونی شەهوەتی دامێن،

و ئەگەر دامێنیشی تێربو پلەو پایەی خۆش دەویت، ئەوجا نەخۆشیەکانی دڵ دەست پێ دەکات وەکو حەسوودی و خۆ بەزل زانین کەواتە، واچاکە نەفسی خۆمان بەرەڵا نەکەین تەنانەت لە خواردنی حەڵاڵیش با بیزانین پێشینانمان چۆن بونە؟ ئافرەتەساڵیحەکانی پێش ئێمە بە پیاوەکانیان دەگوت کە لە ماڵ دەرئەچون بۆ کەسابەت: ﴿اتق اللّٰه فينا إياك وكسبَ الحرام، فإنا نصبر على الجوع والعطش ولا نصبر على حرِّ النار وغضب الجبار﴾ واتە: لە خوا بترسە و ئاگاداری کەسابەتی حەرام بن، چونکە ئێمە خۆمان دەگرین لەسەر برسیەتی و تینویەتی دونیا، بەڵام خۆمان ناگرین لەسەر گەرمایی ئاگری دۆزەخ و تورە

[١] - الترمذي/٢٣٨٠.

بوونی خوای گەورە، کەواتە، خۆمان و ماڵ و منداڵمان فێری حەڵاڵ خواردن بکەین و خواردن نەبێتە هەموو هیوا و ئاواتمان، بە پێچەوانەی بێ باوەڕان چونکە ئەوان تەنها بە دوای تێربونی حەز و ئارەزوەکانی نەفسی خۆیانن، هەر وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ﴾[1] واتە: ئەوانەی بێباوەڕبوون لەزەت ئەبەن و ئەخۆن لە دونیادا وەکو ئاژەڵ و بیری هیچ شتێکیان لا نیە ئاگریش جێگایە بۆیان.

واتە چەند ڕۆژێ ڕائەبوێرن بەڵام سەرەنجامیان ئاگری دۆزەخە پەنا بە خوای گەورە، یارەبی قەناعەتمان پێ ببەخشە و دورمان بکەوە لە حەرام و لە هەموو ئەو شتانەی پێت ناخۆشە ئامین.

[1] - محمد ١٢

# فەرموودەی (٣٩)

## ڕەوشت جوانی

**﴿عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ يَقُولُ: إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ﴾**[١] واتە: لە دایکی باوەڕدارانەوە عایشە (ڕەزای خوای تعالی لێ بێت) لە پێغەمبەری خواوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: بەڕاستی باوەڕدار بە ڕەوشت جوانی خۆی دەگاتە پلەی ئەو کەسانەی بە ڕۆژ بە ڕۆژوون و بەشەویش خەریکی شەونوێژن.

**ڕوونکردنەوە:** خۆشەویستان ڕەوشت جوانی زۆر لەوە گەورەترە بتوانین لە یەک وانە باس بکەین، بەڵام ئاماژە بە جێگای ڕەوشت جوانی دەکەین، هەموو مرۆڤەکان بە تێکڕا پێیان خۆشە چاک بن و بە چاکە باسیان بکرێت، بەڵام بابیزانین پێغەمبەری سەروەر ﴿ﷺ﴾ کێی پێ چاکە؟ بەڵکو کێ چاکترین کەسە هەر وەکو دەفەرموێت: **﴿إِنَّ خِيَارَكُمْ أَحَاسِنُكُمْ أَخْلَاقًا﴾**[٢] واتە: چاکترینتان ئەو کەسەیە ڕەوشتی لە هەمووتان جوانتر بێت.

بەڵکو قورسترین چاکەیەک بخرێتە ناو تەرازوی چاکەکانی بەندە لە ڕۆژی دوایی ئەوە ڕەوشت جوانیە، هەر وەکو پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت: **﴿مَا**

---

[١] - أبوداود/٤٧٩٨

[٢] - البخاري ٦٠٣٥

**مِنْ شَيْءٍ أَثْقَلُ فِي الْمِيزَانِ مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ﴾**[1] کەواتە، با هەولبدەین خۆمان بڕازێنینەوە بە ڕەوشتی ئیسلام، چونکە ئەمڕۆ خەڵک تانە لە ئیسلام دەدات بە هۆی ڕەوشت ناشرینی هەندێک لە موسوڵمانان، خۆشەویستانم، با بزانین پێغەمبەری پێشەوامان ﴿ﷺ﴾چ ئامۆژگاریەکمان ئاڕاستە دەکات و دەفەرمووێت:

**﴿اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْتَ وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ﴾**[2]

واتە: لە هەر شوێنێک بووی لە خوا بترسە ئەگەر توشی تاوانێکیش بووی چاکەیەکی بەدوایەوە بکە دەیسڕێتەوە و بەڕەوشت جوانی هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ خەڵک.

واتە خوای گەورە لەیاد نەکەن و ئەگەر توشی هەڵەیەکیش بوون هەڵەکانتان بسڕنەوە بە چاکە و ڕەوشتیشتان با جوان بێت، با بیزانین خوای گەورە بە چ شتێک ستایش و سەنای پێغەمبەری خۆی ﴿ﷺ﴾ دەکات هەر وەکو دەفەرمووێت: **﴿إِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾**[3] واتە: بەڕاستیی تۆ لەسەر خوڕەوشتێکی ئێجگار پەسەند و گەورەیت.

چونکە پێغەمبەرمان ﴿ﷺ﴾ **﴿كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ﴾**[4] واتە: خو ڕەوشتی بە گوێرەی قورئان بووە.

---

[1] - أبوداود٤٧٩٩

[2] - الترمذي ١٩٨٧

[3] - قلم ٤

[4] - أحمد٢٦٠١

کەواتە، پلەی ڕەوشت جوانی ئەوەندە بەرزە، بەڵام دەبێت بیزانین ئەو ڕەوشتە لای خوای گەورە نرخی هەیە، کە باوەڕی لەگەڵ بێت، ئەگەرنا بێباوەڕ تەنها لە دونیا ڕەوشت جوانی سوودی بۆ هەیە، بەڵام لە دوا ڕۆژی هیچ سوودی پێنا گەینێت هەروەکو دایکی باوەڕداران عایشە دەفەرموویێت گوتم: ﴿يَا رَسُولَ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ ابْنُ جُدْعَانَ كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ يَصِلُ الرَّحِمَ وَيُطْعِمُ الْمِسْكِينَ فَهَلْ ذَاكَ نَافِعُهُ؟ قَالَ: لَا يَنْفَعُهُ إِنَّهُ لَمْ يَقُلْ يَوْمًا رَبِّ اغْفِرْلِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ﴾[1] واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کوڕی جودعان لە سەردەمی نەفامی پەیوەندی خزمایەتی دەگەیاند و هەژارانی نان دەدا ئایا ئەمە هیچ سوودێکی بۆی دەبێت؟ پێغەمبەری سەروەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: نەخێر چونکە ڕۆژێک نەیگوت پەروەردیگارە لێم خۆش بە لە دوا ڕۆژ.

واتە چونکە باوەڕی نەبووە، بۆیە ڕەوشت جوانی بەبێ باوەڕ و تەوحیدێکی پاك هیچ سوودی نیە لە دوا ڕۆژ.

یارب بۆ خاتری ناوە جوانەکانت لە دونیا ڕەوشتێکی جوانمان پێ ببەخشە لە دوا رۆژیش لێمان خۆش بە و بە ڕەحمەتی خۆت بە دیداری خۆتمان شاد بکە بە بێ حیساب ئامین

[1] ـ مسلم ٢١٤

# فەرموودەی (٤٠)

# چاکەکاری

﴿عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﴿ﷺ﴾ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ وَ إِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذِّبْحَةَ وَ لْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ وَ لْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ﴾[1] واتە: لە هاوەڵی ئازیزەوە شەدادی کوڕی ئەوسەوە (ڕەزای خوای گەورەی لێ بێت) لە خۆشەویستی مەزنەوە ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: خوای کەورە واجبی کردوە کە چاکە لە گەڵ هەموو شتێک بکرێت، ئەگەر کەسێکتان کوشت بە (قیساس) بە چاکی بیکوژن (بە ئاسانترین ڕێگا) و ئەگەر سەری شتێکتان بڕی (ئاژەڵ) بە چاکی سەری ببڕن و چەقۆکەتان باش تیژ بکەن و سەربڕاوەکەتان ڕحەت بکەن.

**ڕوونکردنەوە:** خۆشەویستانم با لە سەرەتادا بیزانین (ئیحسان) واتە چی؟ بۆ ئەوەی بە تێگەیشتنەوە ئەنجامی بدەین مامۆستای سەروەرمان پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بۆمان ڕوون دەکاتەوە لە واتای ئیحسان و دەفەرمووێت: ﴿ٱلإحسان أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ﴾[2] واتە: بەو شێوەیە خوای گەورە بپەرستی هەر وەکو ببینی ئەگەر تۆش ئەو نەبینی خۆ ئەو تۆ دەبینێت.

---

[1] - الترمذي ١٤٠٩

[2] - البخاري ٥٠

واتە، هەستکردن بە چاودێری خوای باڵادەست لە هەموو هەڵسوکەوتێکدا.

ئەبێ بیزانین ئیحسان پلە بەرزەکەی ئایینی ئیسلامە واتە، هەموو چاکەکارێك (محسن) باوەڕداریشە و موسوڵمانیشە بەڵام مەرج نیە موسوڵمان و باوەڕدار گەیشتبنە پلەی موحسین، با باش بیزانین سەروەرمان ﴿ﷺ﴾ فێرمان دەکات کە بە پلە نزمەکان ڕازی نەبین و بە بەردەوام هەوڵی پلە بەرزەکان بدەین، هەر وەکو فەرموویەتی: ﴿إِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَسَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ وَأَعْلَى الْجَنَّةِ وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ وَمِنْهُ تَفَجَّرُأَنْهَارُ الْجَنَّةِ﴾[1] واتە: ئەگەر لە خوای گەورە پاڕانەوە داوای بەهەشتی فیردەوس بکەن چونکە فیردەوس خۆشترینی بەهەشتەکانە و سەقفەکەشی عەرشی خوای باڵا دەستە و هەموو ڕووبارەکانی ناو بەهەشت سەرچاوەکەیان لە وێ دەست پێ دەکات.

بەڕاستی جێگای داخە زۆربەی خەڵک پێشبڕکێیان لەسەر دونیا و کۆکردنەوەی ماڵ و سامانە، بەڵام بابیزانین هاوەڵانی سەروەرمان(ڕەزای خوایان لێ بێت) بۆچ شتێک پێشبڕکێیان دەکرد؟ خوای باڵا دەست بۆمان باسی پێغەمبەران دەکات (عليهم الصلاة و السلام) و دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًاوَ كَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ﴾[2] واتە: بەڕاستی ئەوان پێشبڕکێیان دەکرد بۆ خێر و چاکە و لە ئێمە دەپاڕانەوە بەترس و بەئومێدەوە و

[1] - البخاري/٧٤٢٣

[2] - الأنبياء ٩٠

بەڕاستی ملکەچی ئێمە بوون.

واتە، دەبێت بزانین ئەوانەی بۆ دونیا هەوڵ دەدەن زۆر نەزانن بۆیە هەموو هەوڵ و کۆشش و خەمیان بۆ دونیایەکی کاتی و کەمە، چونکە هەر لە بواری دونیا شارەزانە هەر وەکو خوای گەورە دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ﴾[1] واتە: تەنها لە ڕواڵەتی ژیانی دونیا زانان، بەڵام زۆر بێ ئاگانە لە قیامەت و دوا ڕۆژیان.

بەڵام باوەڕداری زانا و تێگەیشتو ئەو کەسەیە هەموو خەمی ئەوەیە چۆن ئەوەی لای خوایە بەدەستی بهێنێت، بزانە خوای باڵا دەست چۆن بەندەکانی فێر دەکات و هانیان دەدات بۆ ئەوەی خۆیان خەریکی شتی کەم نرخ نەکەن، بەڵکو هەوڵبدەن بۆ ئەوەی کاتە بەنرخەکانی تەمەنیان سەرف بکەن بۆ بەدەست هێنانی شتێکی بە نرختر ئەویش بەهەشتی خوای گەورەیە هەروەکو فەرموویەتی:﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ () عَلَى الْأَرَائِكِ يَنظُرُونَ () تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَالنَّعِيمِ () يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ() خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ﴾[2] واتە: بەڕاستیی چاکەکاران لە ناو خۆشیی و بەهرەیەکی یەجگار زۆردان لە بەهەشتدا لەسەر کورسی و قەنەفە رازاوەکانی بەهەشت دانیشتوون و تەماشای ئەو هەموو ناز و نیعمەت و بەهرەی بەهەشت دەکەن کە بۆیان ئامادە کراوە لە

---

[1] - الروم ٧

[2] - المطففين ٢٢-٢٦

ڕوخسارياندا ڕوو گەشيی و خۆشی بەهەشت دەبينی و دەزانيت، لە شەرابێكی پاک و ساف و سەر مۆريان پێدەنۆشن دوا قوميشی بۆنی ميسكی لێ دێت جا ئەوانەی كە پێشبڕكێ و دەست پێشخەری دەكەن با لەوەدا دەست پێش خەری و كێبەركێ بكەن و هەوڵبدەن بۆ كاروكردەوەی چاک.

ألله أكبر لە گەورەيی قورئان خوا ڕاستی فەرمووە: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ﴾[1] واتە: بەڕاستی ئەم قورئانە ڕێنوێنی دەكات بۆ چاكترينی ڕێگا.

براكانم دەبێت بزانين چاكترين كردەوە بريتيە لە دينداری چاكەكاران خوای باڵادەست فەرموويەتی: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾[2] واتە: ئاخۆ دينداريێک هەبێت ئاينی لەو كەسە باشتر و چاكتر بێت؟ كە خۆی دابێتە دەست خوای گەورە و لە چاكەكاران بێت.

زانايانی بەلاغە دەفەرموون ئەو (مَنْ) بۆ ئينكاريە، واتە كەس لە چاكەكاران چاكتر نيە.

لە كۆتايی بەڕاستی پلەو پايەی موحسين گەورەترە لە وەی كە باس بكرێت، بەڵام وەكو گوتراوە ئەگەر هەمووشی باس نەكەين بەڵام ئەماژە بە هەندێک پلەی موحسينان دەكەين، ئەمە چەند ئايەتێكە باسی پلە و پايەی موحسينان دەكات:

---

[1] - الاسراء ٩

[2] - النساء/١٢٥

﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾[1] خوا چاکەکارانی خۆش دەوێت.

﴿إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ﴾[2] بەڕاستی بەزەیم وا لە چاکەکاران نێزیکە.

﴿بُشْرَى لِلْمُحْسِنِينَ﴾[3] مژدە بدە چاکەکاران،

﴿إِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ﴾[4] بەڕاستی خوا لەگەڵ چاکەکارانە.

﴿فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَالْمُحْسِنِينَ﴾[5] بەڕاستیخوای گەورە پاداشتی چاکەکاران ون ناکات.

خوای گەورەیە بمان گێڕێت لە موحسین و لەگەڵ ئەوانیش حەشرمان بکات.

---

[1] - البقرة ١٩٥

[2] - الأعراف ٥٦

[3] - الأحقاف ١٢

[4] - العنكبوت ٦٩

[5] - يوسف ٩٠

# ئامۆژگاریەك پێش كۆتایی

پاش ئەوەی کۆتاییمان بە فەرموودەکانی سەروەرمان (ﷺ) هێنا، پێم خۆش بوو فەرمانێکی خوای باڵا دەست بە بیری خۆم و ئێوەی خۆشەویست بهێنمەوە، ئەویش ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە خوای موتەعال دەفەرمووێت: ﴿وَتُوبُوا إِلَى اللَّـهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[1] واتە: ئەی باوەڕداران! هەمووتان بەرەو لای خوای گەورە بگەڕێنەوە و پەشیمان ببنەوە و بەشکو هەمووتان هەم لە دونیاو هەم لە دواڕۆژ ڕزگارو بەختەوەر ببن.

بەڵام نەك تەوبەیەك بە هەواو حەزی خۆمان، بەڵکو ئەو تەوبەیەی کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّـهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا﴾[2] واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بگەڕێنەوە بۆلای خوای گەورە بە تەوبە و گەڕانەوەیەکی ئیجگاری.

لە پێشەوا (عومەر)یان پرسی: تەوبەی (نەصووح) چیە؟ فەرمووی: تەوبەی (نەصووح) ئەوەیە کە ئەو کەسە تاوانکارە لە تاوانەکانی پەشیمان ببێتەوەو جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەریان، چۆن شیر هەرکە لە گوانی ئاژەڵەکە هاتە دەر، جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ گوانی ئاژەڵەکە.

بەڕێزەکانم باسی دوو جۆرە تەوبە دەکەین،

یەکەمیان، (تەوبەی درۆ )

---

[1] ـ النور ٣١

[2] التحريم ٨

مەنسووری کوڕی عەمار دەفەرموویت: برادەرێکم هەبوو زۆر خراپ بوو، بەڵام تەوبەی کرد و پەشیمان بوە، دەمبینی زۆر بەڕۆژو دەبوو و زۆریش شەو نوێژی دەکرد و خەریکی پەرستن دەبوو، بەڵام چەند ڕۆژێک ون بوو لەبەر چاوم منیش پرسیم گوتیان: نەخۆشە، ڕۆیشتم بۆ سەرەدانی لە دەرگام دا کچەکەی هاتە دەرەوە پێم گوت: بە باوکت بڵێ مەنسوور هاتوە، گوتی: فەرموو منیش بینیم وا لەناو خانووەکە دەم و چاوی ڕەش هەڵگەڕابوو چاوی پڕ ببوو لە فرمێسک و لێوەکانی ئەستوور ببون، زۆر ترسام و پێم گوت: براکەم زۆر بڵێ (لاإله إلااللّـه) بەتوندی تەماشای کردم ئەوجا لە خۆی چوو، جارێکی تر دووبارە پێم گوت: بڵێ: (لاإله إلااللّـه) چەند جارێک پێم گوتەوە، ئەوجا چاوەکانی کردەوە و گوتی: مەنسووری برام من و ئەو وشەیە لەیەک دوور خراینەوە گوتم: (لاحول ولاقوة إلاباللّـه) گوتم: باشە کوا شەونوێژ و ڕۆژوەکانت؟ گوتی: تەوبەکەم بۆ خوای گەورە نەبوو، بەڵکو تەوبەکەم بە درۆ بوو، تەنها بۆ ناو بانگم بوو، هەرکاتێک تەنهابام هەموو سنوورەکانی خوای گەورەم دەبەزاند لە سەر ئەو ڕێگا خراپە بەردەوام بووم تاوەکو نەخۆش کەوتم و بارودۆخم خراپ بوو، گوتمە: کچەکەم قورئانەکەم بۆ بێنە چەند لاپەڕەیەکم خوێند و قورئانەکەم بەرز کرد و گوتم: خوایە بۆ خاتری کەلامی خۆت شیفام بۆ بنێرە بەڵێن بێت بێ فەرمانیت ناکەم تاوەکو بمرم، سپاس بۆ خوای گەورە چاکبومەوە بەڵام شەیتان فریویدام و گەڕامەوە بۆ سەر تاوانەکانم ماوەیەکی زۆر تاوەکو جارێکی تر نەخۆش کەوتم، بە هەمان شێوەی یەکەمجا داوام لە کچەکەم کرد قورئانەکەم بۆ بێنە، دووبارە چەند لاپەڕەیەکم خوێندەوە و لە خوای گەورە پاڕامەوە ئەو جارە

چاک ببمەوە بەڵێن بێت تابمرم تاوان ئەنجام نەدەم، بە فەزڵی خوای گەورە شیفام بۆ هات بەڵام دیسان بەڵێنەکەم پشت گوێ خستەوە و گەڕامەوە سەر تاوانەکان بە بێ ئەوەی بزانم هیچ بەڵێنێکم دابێت، لە دوای ماوەیەکی زۆر توشی ئەو نەخۆشیە بووم کە دەبینی وەکو هەموو جار بە کچەکەم گوت: قورئانم بۆ بێنە کە قورئانم کردەوە هیچ پیتم لە قورئان نەبینی زانیم خوای گەورە لێم توڕە بووە دەستم بەرز کردەوە و گوتم: خوایە بۆ خاتری گەورەیی ئەو کەلامە شیفام بۆ بنێرە، هەر وەکو گوێم لێبو گوتیان: تەوبە دەکەی ئەگەر نەخۆش دەبی و دەگەڕێیەوە سەر تاوانەکانت ئەگەر چاک دەبیەوە، ئایا ناترسێی لەسەر تاوان مردنت بگاتە سەرت؟ مەنسوور دەفەرمووێت: ویستم بڕۆم واللَّـه پێش ئەوەی لە ماڵەکە بچمە دەرەوە گوتیان: مرد.[١] (پەنا بەخوای گەورە)

بەڵام تەوبەی جۆری دووەم تەوبەی ڕاستەقینەیە:

لە سەحیحی موسلیم هاتوە پیاوێک بەناوی ماعزی کوڕی مالیک هاتە خزمەتی پێغەمبەری سەروەر ﴿ﷺ﴾ گوتی: ئەی خۆشەویستی خوا ﴿ﷺ﴾ پاکم بکەوە پێغەمبەری بەسۆز ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: بگەڕێوە و داوای لێ خۆش بوون بکە و تەوبە بکە، دووبارە ماوەیەکی تر هاتەوە و گوتی: ئەی خۆشەویستی خوا ﴿ﷺ﴾ پاکم بکەوە، پێغەمبەری بەسۆز ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: بگەڕێوە و داوای لێ خۆش بوون بکە و تەوبە بکە، ماوەیەکی تر هاتەوە و گوتی: ئەی خۆشەویستی خوا ﴿ﷺ﴾ پاکم بکەوە، پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لە چوارەمین جار فەرمووی: ئەوە

[١] - الف قصة وقصة من قصص الصالحين ونوادر الزاهدين

شێتە؟ گوتیان: نەخێر فەرمووی: سەرخۆشە؟ بۆنیان کرد گوتیان: نەخێر پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ پێی فەرموو: ئایا زینات کردوە؟ گوتی: بەڵێ ئەوجا پێغەمبەری سەروەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی کرد و بەرد باران کرا.

ئەوجا خەڵک بوونە دوو بۆچون هەندێکیان گوتیان: بە هیلاکەت چوو و تاوانەکەی لە ناوی برد، ئەوانی تریش گوتیان: هیچ تەوبەیەک وەکو تەوبەی ماعز گەورە نیە، ئەوجا پێغەمبەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: واللّـه تەوبەیەکی وای کرد ئەگەر دابەشی سەر ئوممەتێک بکرابایە بەشی هەمووانی دەکرد.

بۆیە خۆشەویشتانم بابیر بکەینەوە ژیرانە کام تەوبەمان پێ خۆشە لەم دوو تەوبەیە؟ با بۆ خۆمان هەڵبژێرین،

داوامان لەخاوەنی جیهانیانە تەوبەیەکی ڕەستەقینەمان بەقسمەت بکات پێش مردنمان و لە دوای مردنیش غەرقی سۆز و مێهری خۆیمان بکات ئامین

# کۆتایی

بەڕێزان بەڕاستی سەیری خۆم کرد زۆر پێویستیم بەم سیفاتانە بوو، کە بە هۆیەوە خۆم بگەینم بە کاروانی باوەڕداران، بۆیە هەستام بەگەڕان لە دوای ئەو فەرموودە شیرینانەی باسی باوەڕ و باوەڕدار دەکات، چونکە لەوانەیە زۆرێک وەکو من پێویستیان بەم فەرموودانەبێت کە ببێتە هاندەرێک بۆ خۆ گەیاندن بە کاروانی باوەڕدارە ڕاستەقینەکانی پێش خۆمان، ئەوانەی کە بست بە بستێ شوێن پێ هەڵگری پێغەمبەری پێشەوا ﴿ﷺ﴾ بوون و زۆریش هەوڵمدا تەنها ئەو فەرموودانەی زانایانی فەرموودە ناس بەڕاستیان داناوە بهێنمەوە، لەگەڵ دان پێدانانم بە کەمو کوری خۆم بەڵام هەر ئەوەندەمان لە توانا بوو، بە فەزل و منەتی خوای دەسەڵات دار، ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا﴾[1] واتە: هەتا دەتوانن بەتەقوا و خواناس بن، و گوێڕایەڵ و فەرمانبەردار بن. ئەوەی ڕاست و دروستە بێگومان دینی خوای گەورەیە و ڕێبازی پێغەمبەری پێشەوایە ﴿ﷺ﴾، ئەوەی هەڵە و کەمو کورتیشە لە نەفسە خراپەکەی من و شەیتانی ئیبلیسە. داواکارم لە خاوەنی جیهانیان ئەم کتێبە بکاتە مایەی سوود بۆ خۆم و هەموو خوێنەرێک و پەنا بەخوای گەورە کە ببمە پردێک خەڵکان بەسەری بپەڕنەوە بۆ بەهەشت ئەوجا فڕەبدرێتە ناو دۆزەخەوە. ئامین والحمدللّٰه رب العالمين.

براتان: باوکی شافعی شەوی دوو شەممە /٧/جمادی دووەم/١٤٤٣ه

[1] - التغابن ١٦

## ناوەڕۆك